یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
لە کوردستاندا
44
لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی چوارەم - کانوونی دووەمی - ٢٠١٢

## لەگەڵ وەفایی دا

یەك دڵو یەك گیان!

گرنگی باوەڕ

ژیان قوتابخانەیە..!

وەڵامی ئێمە!

هاوڕێی زانکۆ

منداڵی دوێنێ من بووم، منداڵی ئەمڕۆش براکەمە،
منداڵی سبەینێش منداڵەکەمە!

باشترین نوێنەرانی فرۆش.. کێن؟

Www.bryarmagazine.com




# کارگێڕی و بازاڕسازی




























ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی- نهۆمی سێیەم

نزیك پردی خەسرەو خاڵ

٣١٩٣٩٤٦ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

E-mail: bryar@bryarmagazine.com



دابەشکردن: کۆمپانیای پەیك

٣٢٠٤٠٩٦ - ٠٧٧٠٨٦٤٩٢١٠



The first Magazine Specialized in Manageme[nt] and Human Development in Kurdistan






[م]انگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

[س]اڵی چوارەم - ژمارە 44 - کانوونی دووەمی 2012





چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد

نرخ 2500 دینار




# یەك دڵو یەك گیان!

یەکێـك لـە گەورەترین بەڵگەی نیشـتمانپەروەریو هەسـتی کوردپـەروەریو سـۆزی کوردانە، هەسـتکردنە بە ئێـشو ئازارو نارەحەتیو دژواری هەموو کوردێك لە هەر پارچەیەکی کوردستان، یاخود لە هەر شوێنێکی سەررووی زەوی بێت.

هەسـتکردن بە یەك لاشەییو یەك جەسـتەییو یەکپارچەیی کوردو کوردسـتان، دەبێت بەشـێك بێت لە کلتورو ستراتیژییەتی ژیانو پەروەردەو ئاکاری هەمیشەیی هەموو تاکێکی کورد.

ڕووداوی ئـەم دواییـەی (شـەرناخ) تاقیکردنەوەیـەك بوو بۆ هەسـتی کوردایەتیو ڕۆحـی مەردایەتیو هەسـتکردن بە ئازاری برایانی کوردی هاوزمانو هاونەتەوە!

کە بەداخەوە سـیمایەکی زۆر ناشـیرین بوو، کە ئێمە بەسەر لاشـەی کوردانی هەژاری کوردستانی باکورداو لە کاتێکدا کە هێشتا خوێنـی ئاڵیـان بەسـەربەفری چیا سەرکەشـەکانی کوردسـتاندا دەهاتەخـوارو فرمێسـکی بـە خوڕی دایکانی جگەر سـووتاویان نەوەستابوو!

زەماوەندمان سـازکردو لە جەژنی فەلـەدا ئاهەنگمان دەگێڕاو هیچ ڕەچاوی هەستو نەستی ئەوانمان نەکرد!

نەدەبـوو لەسـەر برینەکانـی ئـەوان هەڵپەڕیـن، نەدەبـوا هێنـدە هەسـتی مرۆڤایەتـیو کوردایەتیمان لاواز بێـت کە وەکو دوژمنەکانیشـمان نەتوانیـن تیمسـاح ئاسـاش فرمێسـکێکیان بۆ بڕێژین!!

ئێمە سـاڵەهای سـاڵە سـرود بۆ وڵاتو نیشـتمان دەخوێنینو درووود بۆ خوێنی شەهیدەکانمان دەنێرین!

هەموو بسـتێکی ئەو خاکەی لەسەری هەڵدەپەڕین بە خوێنی شـەهیدەکانمان ئاودراوە، هەموو کوردێکیش مافی بەم نیشتمانەوە هەیە، دەبێت هەرگیز ئەو ڕاستییانە لەبیرنەکەین!

ئێمـە ئەگـەر نەتوانیـن بەبەشـداری خەمـی ئـەوانو هاوبەشیکردنیان هاوکارییان بکەین، ئەی دەبێت چیمان پێ بکرێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان؟!

ئەگـەر ئێمە نەتوانیـن تەنها ئاهەنـگو بۆنەکانمان ڕابگرین لەبەر هەسـتی پڕبرینو ناسـۆری ئەوان، دەبێت چۆن بتوانین بۆ دیاریکردنی چارەنووسیان هاوکارییان بکەین؟!

ئەگەر ئێمە بەبەرچاومانەوە خوێنی ڕژاوی براو خوشکەکانمان ببینیـن لـە پارچەکانی ئەو کوردسـتانەی لەت لەتکـراوەو وەکو لاشەیەکی بریندار هەمیشە خوێنی لێدەتکێت، ئەوسا نەك هەستی فرمێسـك ڕشتنمان نەبێت، بەڵکو ئامادەنین شاییو هەڵپەڕکێشمان ڕابگرین.

ئەوا دەبێتماڵاوایی لە کوردایەتی بکەین..

دەبێت لەهەر شوێنێك ئەگەر ڕەشماڵی ماڵە کوردێکیشی لێبێت، ببێتە مایەی حەسـانەوەو هیواو ئومێدی هەموو کوردێك، نەك لە بارودۆخێکی لەباری وەك ئەمڕۆدا کە زۆر گونجاوە کورد هەڵوێستو ڕۆڵی کارای خۆی هەبێت.

کاڵبوونـەوەو متمانـە نەبـوون بەبەهـا نیشـتمانیو نەتەوەییەکانمـان، زیـان لـە ئێسـتاو ئایندەی ئـەم نەتەوەیە دەگەیەنێتو زێتر بە کوردو کوردستان نامۆمان دەکات.

پێویستە سەرقاڵبوون بە دنیاو ئاڵۆزی ڕۆژگارەوە وامان لێنەکات کە دۆزی نەتەوەییمان لەبیربچێتو مەسـەلە گەورەکان فەرامۆش بکەین.

دەبێـت هەموومان بۆ ئازاری یەکتر بگرین، بۆ خۆشـی یەکتر پێبکەنین، وەکو (حەمدی) شاعیر دەڵێت:

سـوبح پێناکەنـیٚ، تا بێنەوایە شـەو بـە دڵ نەگری
گوڵیٚ ناپشـکویٚ تا بولبولی سـوبحیٚ بـە کوڵ نەگری
بـەری نابیٚ درەختی باغی عالەم، تاهەموو وەك یەك
بەیەك سۆزو بەیەك شۆرو بەیەك دەم چڵ بەچڵ نەگری

وێڕای ڕێزو سوپاسمان بۆ هەموو کوردێکی دڵسۆزو کوردپەروەر، کە هەسـت بە ئازاری گەلەکەی دەکات، لەهەر شـوێنێکی دونیابێو هاوسـۆزیو هاوخەمی خۆی بۆ خوشـكو برایانی لە کوردسـتانی باکور دەربڕیوە.

# کارگێڕی بە گوفتار

ئەگەر لە ژیاندا بەختەوەر نەبوویت، ئەوا هۆکارەکەی ئەوەیە کە داوای شتێك دەکەیت کە هی تۆ نییەو شتێك فەرامۆش دەکەیت کە هی خۆتە!

شکسپیر

پێویستە لەسەرم تێبکۆشم،
بەڵام پێویست نییە لەسەرم بگەم بە سەرکەوتن!

بدیع الزمان هەمەدانی

ئەگەر کەشتیوانەکان زۆربوون، پاپۆڕەکە نقووم دەبێت!

سوفیانی سەوری

گەنجێتی بە تەمەن نییە،
بەڵکو چۆنییەتی پەیوەندیکردنە بە جیهانەوە!

جان بیرك

ئەو گەلە چەند داماوە،
کە چاوەڕوانی پاڵەوانێك دەکات!

برتولت برشت

هاوڕێیەتی کەسێکی باش،
نیعمەتێکە لە لایەن خوداوەندەوە!

ڤۆلتێر



# بە هۆی نەبوونی زانیاری تەواوەوە بڕیاری هەڵە لە دایك دەبێت!!

لە گەشتێکی ئاسمانیدا دوو گەشتیار پێکەوە لە دەروازەی گومرگی یەکێك لە فڕۆکەخانەکاندا دەڕۆیشتن، یەکەمیان کابرایەکی ژاپۆنی بوو، کە دوو جانتای گەورەی هەڵگرتبوو، دووەمیشیان کابرایەکی بەریتانی بوو، کە یارمەتی کابرای ژاپۆنی دەدا، بۆ هەڵگرتنی جانتاکانی.

لە ناکاو کاتژمێری کابرای ژاپۆنی زەنگێکی نائاسایی لێدا، کابرای ژاپۆنی دەستی بە دوگمەیەکی بچووکدا ناو دەستی بە قسان کرد، لە ڕێگای تەلەفۆنێکی زۆر بچووکەوە، کە لە نێو کاتژمێرەکەدا بوو!

کابرای بەریتانی سەری لەم تەکنەلۆژیا پێشکەوتووە سوڕماو لە بەرامبەردا داوای لە ژاپۆنییەکە کرد، کە بە (٥٠٠٠ دۆلار کاتژمێرەکەی پێ بفرۆشێت، بەڵام کابرای ژاپۆنی قبوڵی نەکرد!

کابرای بەریتانی بەردەوامبوو لە یارمەتیدانی کابرای ژاپۆنیدا، پاش چەند خولەکێك دووبارە زەنگی کاتژمێرەکە لێی دا، ئەمجارەیان کابرا قەپاغی کاتژمێرەکەی هەڵدایەوەو شاشەیەكو کیبۆردێکی بچکۆلە وەدەرکەوتوو بۆ کردنەوەو وەڵامدانەوەی ئیمەیڵەکانی بەکاریدەهێنا، کابرای بەریتانی زیاتر سەری لە کاتژمێرەکە سوڕماو ئەمجارەیان داوای لێکرد، کە بە (٢٥٠٠٠) دۆلار پێی بفرۆشێت، بەڵام کابرای ژاپۆنی پێی گوت، کە ئەم کاتژمێرە بۆ فرۆشتن نییە!

بۆ جاری سێیەم زەنگی کاتژمێرەکە لێی دا، ئەمجارەیان بۆ وەرگرتنی فاکسێك بەکاریهێنا! کابرای بەریتانی بڕیاری دابوو، بە هەرچەندێك بێت دەبێت ئەو کاتژمێرە بکڕێت، هەربۆیە تا (٣٠٠٠٠٠) سێ سەد هەزار دۆلار بەردەوام بوو! کابرای ژاپۆنیش لێی پرسی کە ئایا ئێستا ئەو پارەیەی پێیە؟ ئەویش دەفتەری چەکەکانی دەرهێناو چەکێکی بە بڕی (٣٠٠٠٠٠) هەزار دۆلار بۆ بڕی، لەو کاتەدا کابرای ژاپۆنی یەکسەر لە ڕێگای کاتژمێرەکەیەوە، پارەکەی تەحویلی حسابەکەی کردو وێنەیەکی چەکەکەی بۆ بانکەکەی خۆی نارد، پاشان کاتژمێرەکەی لە دەستی کردەوەو دوورکەوتەوە.

کابرای بەریتانی هاواری کرد، بووەستە جانتاکانت بەجێهێشت!

ژاپۆنییەکەش لە وەڵامدا گوتی: ئەوانە جانتای من نین، ئەو جانتایانە پاترییە، بۆ کاتژمێرەکە!!

لەم چیرۆکەوە فێردەبین:

١- پەلەنەکەین لە بڕیارداندا، تا زانیاری تەواومان لە لا کۆدەبێتەوەو دەزانین چی پێویستەو چیمان دەوێتو دەبێت چی بکەین؟

٢- دەبێت وردبین بینو تەنها بە ڕووکەشی شتەکان سەرسام نەبین.

٣- بڕیاری نادروست ماڵو سامان بەهەدەر دەبات.

٤- هەندێجار بڕیارەکان لەسەر ئاستی کەسی نینو بەڵکو لەسەر ئاستی وڵاتو حکومەتن. جا ئەگەر بە وریاییو زیرەکییەوە بڕیار نەدرێت، ئەوا زیانێکی گەورە لەسەروەتو سامانو داهاتی وڵات دەکەوێت.

٥- کۆکردنەوەی زانیاریو ڕوونکردنەوەی پێویستو پرسو ڕاوێژ، زۆر پێویستە بۆ هەنگاونانی دروست لە هەر پرۆژەو بەرنامەیەکدا.

٦- کابرا ئەو بڕە پارەیەی بۆیە دا، کە وایزانی ئەو کاتژمێرە کارەکانی بۆ ئاسان دەکات، بەڵام نەیزانی کە دەبێت، هەمیشە حەماڵێکی لەگەڵدابێت بۆ هەڵگرتنی پاتری کاتژمێرەکەی!

٧- دڵنیام لەگەڵ خوێندنەوەی چیرۆکەکەدا زۆرشتتان دێ بەخەیاڵدا، هیوادارم چەندین شتی بە سوودی لێوە فێربن!

# تەنها بۆ سەرکردەکان

## ئەگەر ناتەوێت سەرکردەبیت، ئەم لاپەڕەیە مەخوێنەرەوە!

ئایا دوژمنەکانم لەناونابەم، کاتێک دەیانکەم بە دۆستی خۆم؟

ئەبراهام لنکولن

کاتێک کە دێیتە بەرامبەر مێزی کۆبوونەوەکانو چاوت تەنها لەسەر یارمەتیدانو خزمەتکردنی کەسانی ترە، ئەوا کارامەییو کاریگەری هەموو ئەندامانی کۆبوونەوەکە زیاد دەکەیت!

جۆن ماکسویل

تۆ ئەو گۆڕانکارییە بە، کە دەتەوێت لە جیهاندا بیبینیت!

موهەنداس غاندی

سەرکردایەتی ئەم زەمانە، زۆر سەختە، چونکە تۆ نازانیت ئەوانەی لە دواتەوەن، شوێنت دەکەون، یان ڕاوت دەنێن!

نەزانراوە

شایانی ڕێزگرتن بیتو دەستت نەکەوێت، باشترە لەوەی دەستت بکەوێت، بەڵام شایانی نەبیت!

مارک یۆتن

ئەگەر باوەڕت وابێت، کە دەتوانیت کارێک بکەیت، ئەوا لەسەر حەقیت، خۆئەگەر باوەڕت وابێت کە ناتوانیت کارێک بکەیت، ئەوا هەمدیسان هەر لەسەر حەقیت!

میری کای ئاش

# چەمکی کاتو گرنگی لە کارگێڕیدا



بەشی یەکەم

ئا: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

چەمکی کاتو گرنگی لە کارگێڕیدا،

کات ژیانە، کات دەوڵەمەندترینو دەگمەنترین داهاتی مرۆییو ڕێکخستنە، لەو ساتەی کارگێڕی سەریهەڵداوە، وەکو زانستێکو تاکو ئێستاش گرنگی پێداوە، لەبەرئەوە کاتێک دەبینیت بەکارهێنانی ئەکتیڤو گونجاوی کات، جیاوازی لە نێوان شکستخواردنو سەرکەوتن لێکدەداتەوە، کات سەرمایەیەکە تازەناکرێتەوەو ناگەڕێتەوە، هیچ هۆکارێک نییە بۆ وەستانی سوڕانەوەی کات، یان گەڕانەوەی، لێرەوە پێویست دەکات کاتەکان وەبەربهێنین نەک بە فیڕۆیان بدەین.

ئامانجی دووانە لە بەڕێوەبردنی کات کاری بێبەرهەم هیچ کەڵکی نییە، جگە لەوەی کات بە فیڕۆ دەڕوات، هەوڵو کۆششەکان بێئەنجامی ئەرێنی کۆتایی دێن.

ئامانجی بەڕێوەبردنی کات بریتییە لە کاری چڕی هاوسەنگ، کە دەبێتە هۆی بەجێهێنانی ئەکتیڤو دوورکەوتنەوە لە سوتانی جەستەییو دەروونی.

مانای کارگێڕی ئەکتیڤی کات، مانای بەڕێوەبردنی ژیانو هەموو چالاکییەکی مرۆییە، ئەگەر بە ئەکتیڤی بەڕێوە ببرێت هیواو خواستەکان بەدیدێن.

بەرپرسیارێتی تاکەکەسی بۆ بەڕێوەبردنی کاتەکەی، ئەگەر مرۆڤ ڕازی نەبێت بە کەڵکی ئەم بەڕێوەبردنە لە سۆنگەی هەستکردنییەوە بە نرخی کاتەکەی کە ژیانییەتی، ئەوا هیچ شتێک لەگەڵیدا کەڵکی نابێت.

بەرەوپێشبردنی هۆشیاری بە گرنگی بەکارهێنانی ئەکتیڤی کات، چونکە سەرکەوتنی داڕشتنی هەر بەرنامەیەک بۆ بەڕێوەبردنی کات پێویستی بە پەرەپێدانی هەستی تاکە کەسییە بە بەهاو گرنگیو مسۆگەری بەکارهێنانی ئەکتیڤی کات وەکو تاکە ڕێگایەک بۆ سەرکەوتنی تاکەکەسیو خێزانیو پیشەیی.

دیاریکردنی هۆکارەکانی شکستهێنان لە بەکارهێنانی ئەکتیڤی کات بۆ سەرکەوتنی کارگێڕی ئەکتیڤی کاتەکانمان، پێویستە ئەو هۆکارانە بناسین کە بوونەتە هۆی ئەوەی کاتەکانمان لە ئێستادا بە نا ئەکتیڤی بەکاربهێنین.

بەکارهێنانی هەنووکەیی کاتی کارکردن کاتێک دەزانین کاتی ئیشوکار بە هەنووکەیی بەکاربهێنینو ئەوەی دەبێتە بەفیڕۆدانی بەشێکی زۆر لەوە دەتوانرێت خۆ لەم بەفیڕۆدانە بپارێزی، بەرەوپێشبردنی باری ژیری هاوڕێکە لەگەڵ پابەندبوون بە بەڕێوەبردنی کات، زۆرینەی خەڵک لایان وایە ئەو خاسیەتانەیان هەیە کە بتوانن کاتەکانیان بەجوانی بەڕێوەبەرن.

بەڵام گرفتەکە بەردەوام نەبوونو خۆڕاگرییە، چونکە کارگێڕی پێویستی بە بەردەوامیو هەوڵدانو کۆشش هەیە لە خەملاندنی خود.

بەفیڕۆچوونەکانی کات ((خراپ بەڕێوەبردنو ڕێکخستن))، زۆرجار گرفتی کارگێڕی لە ڕێکخراو دێتە پێشەوە، لە ئەنجامی خراپی بەڕێوەبردنو ڕێکخستنەوە لە چەندین بواری جیاواز وەکو نەشیاویو لێنەهاتوویی بێدەسەڵاتی ناڕێکو پێکی نوسینگە.

ناوەندی دەسەڵاتی توند دەسەڵاتی بڕیاردان لە ئاستەکانی سەرۆکایەتی باڵا دەهێڵێتەوە، ئەنجامی ئەوەش کات بە فیڕۆ دەدرێ لە دەستاودەستپێکردنی مامەڵەکان لە ئاستەجیاوازەکانی ڕێکخراوەکە بە بێ سوود. ئەمەش مانای کەمتەرخەمی کردنە بۆ بەڕێوەبردنی ئەکتیڤی کات.

زۆری کارەکانی سەر کاغەز، ئەمەش دەبێتە هۆی بیرۆقراتیو بەفیڕۆدانیو هەوڵو داراییو نەهاتنەدیو ئەنجامەکان، یان زیادەیەک بۆ کاری ڕێکخستن. تەنگژەکان تەنگژە هەوڵەکان پەرتەوازە دەکاتو گرنگیدان بە شتە لە پێشینەکان لا دەدات، تاوەکو ڕووبەڕووی تەنگژەکە ببنەوە، پێویستە پێشبینی تەنگژەکان بکرێتو سیناریۆی بۆ دابڕێژرێ، بۆ مامەڵەکردنی زانستیانە لەگەڵیداو بەڕێوەبردنی ئەگەر ڕووی دا. نەبوونی پسپۆری گەیاندنو بەم پێیەش کات بەفیڕۆ دەڕوات بۆ ڕاستکردنەوەی بارە ناهەموارەکان کە لە ئەنجامی کەمی، یان نەبوونی گەیاندنی ئەکتیڤەوە پەیدا دەبن.

ئا: خەندە ڕەمەزان - زکرا ڕەمزی



# لە ناوبردنی گەندەڵی

بەشی حەوتەم

**بەندی سێیەم: چارە سەرەکانی لاوازی سەرکردەکان**

-گوێگرتن بۆڕای بەرامبەر.

- بڕیاردانی بـە ڕاوێژ.

- دۆزینـــەوەی تاکـــی دڵســـۆزو سەرکەوتوو.

-دروستکردنی ژینگەیەکی تـەندروست دوور لە ململانـێو ترسو دڵەڕاوکێ.

- تێکەڵبـــوون لـەگــەڵ خەڵکـــیو گوێگرتن لێیان.

- چاودێریکردنـــی تێچوونـــەکانو دانانی بودجەیەکی پێویست.

- بایەخـــدان بەخاڵـــی هانـــدانو بەخشینی دیاری بە فەرمانبەرەکان.

- پەروەردەکردنـــی نـــەوەی نوێ بۆ سەرکردایەتیکردن بە تەواوی.

**بەشـــی ســـێیەم: بەندی یەکەم: لە ناوبردنی گەندەڵی:**

لایەنـــی بەرپـــرسو پەیوەندیدار بۆ لەناوبردنـــی گەندەڵـــی جیهانـــی، چەند لایەنێکـــی نێودەوڵەتـــی دیاریکـــراوە ئەرکی سەرشـــانی لەناوبردنی گەندەڵی بـەڕێوەبردنە، لەسەرئاستی جیهانی. ئـەم لایەنانەش ئەمانەن:

**١- ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان:**

چەنـــد بڕیارێکـــی دەرکـــرد بـــۆ ڕووبەڕووبونـــەوەو لەناوبردنی گـەندەڵی، چونکـــە بـــاوەڕی تـــەواوی هەیـــە بـــە مەترســـییەکانی گەندەڵی، تـا چ ڕادەیەك هـەڕەشـــە کاردەکاتـــە ســـەر ئاســـایشو ئاســـودەیی کۆمەڵـــگاکان، هـەروەهـــا ڕێککەوتننامەیەکی دەرکـرد بۆ لەناوبردنی گەندەڵی ساڵی(٢٠٠٤)، زۆر لە وڵاتانی جیهان چوونە پـاڵ ئـەم ڕێککەوتننامەیە.

**٢- بانکـــی نێودەوڵەتـــی:** بانکـــی نێودەوڵەتی کۆمەڵێك هـەنگاوو ستراتیژی دانـــا بـــۆ یارمەتیدانـــی وڵاتـــەکان بـــۆ بەرەنگاری دژ بـە گەندەڵیو کەمکردنەوەی شـــوێن پـێ خـراپەکانی لەســـەر کرداری گـەشەکردنی ئابووری.

**٣- ســـندوقی دراویـــی نێودەوڵەتـــی:** ســـندوقی دراوی نێودەوڵەتـــی بـــۆ کەمکردنـــەوەی گەندەڵـــی، هـەســـتا بەڕاگرتنی کۆمەکییەکانی دارایی بۆ هەر وڵاتێك کـە گەندەڵی هۆیەکە بۆ ڕاگرتنی کرداری گەشەپێدانی ئابووری.

**٤- دیوانـــی چاودێریکردنـــی دارایی:** لایەنێکی بـەرپرســـە بـــۆ وردبینیکردنی دارایـــی، لـــە عێـــراق دامـــەزراوە بـەپێی فەرمانـــی (٧٧)ی ســـاڵی (٢٠٠٤)، کاری پێشکـەشکردنی زانیاری وردو تـایبەت بـە کۆمەڵی خـەڵكو حکومەت ســـەبارەت بە کارەکانی حکومەتو بارودۆخی دارایی بۆ بە هێزکردنی ئابوری لە ڕێگای وردەکاری دارایو ئەنجامـــی کارەکانو لـــە پێنـــاو لەناوبردنی گـەندەڵی دارایی.

**بەندی دووەم: هێندێك چارەسـەر لە ڕووی ئاینییەوە:**

**- بنەمـــای ڕاوێژ لە بەشـــداربوون لە کارگێڕیدا:**

ئـــەم بنەمایـــە یەکێك لـــە کۆڵەکەو تایبەتمەندییەکانی تیۆریی کارگـێڕی لـە ئیسلامدا پێکدەهێنێت، بـەشداریکردنیش فەرمانێکە پابەندبوونی ئـەرکە، (وشـاورهم فـــی الامـــر) واتا: "لـــە کاروبارەکانیشـــدا ڕاوێژییان پێ بکە" خـــوای گەورە ڕێزی لـــە ئادەمیـــزاد گـرتـــووەو مـرۆیەتـــیو ســـەربەرزێتی پاراســـتووە، ئـەمیـــش بە بەشـــداریکـردنیان لـــە فـەرمانـــڕەوای کـارگێڕیدا.

هەڵبـــەت پـەیامبـــەر (درودی خوای لەســـەربێت) لـــە بەڕێوەبردنـــی وڵاتـــی ئیسلامیدا، سوربووە لـەسەر ڕاوێژکـردن، هـــەروەك چوارچێـــوەی ئـەم سیســـتەمە ڕاوێژییـــەی دانـــاوە، کـــە ئەنجومەنێکی بۆ پێکهێناوە لـە چـــواردە نەقیب، کە لە خـــاوەن ڕاو چاوکـــراوەکان دەستنیشـــانی دەکـــردن، لـەوانەی کـە بە ئاوەزیو چاکی گـەواهییـــان بـــۆ دەدرا، جێنشـــینەکانی ڕاشـــدینیش خـــوا لێیـــان ڕازی بێـــت ڕێگـــەی ڕاوێژیان گـرتەبـــەر، بـە ڕێگەی سـەر مەشـــقی پـەیامبەر (سەلامی خوای لێبێت)، هـەروەك پێشەوا (ئەبوبەکر(خـوا لێـــی ڕازی بێت)) کاتێـــك کاروبارێکی بۆ

بهاتایەتە پێش، پێویستی بە ڕاوێژی خاوەنڕاکان بووایە، بانگی چەند هاوەڵێکی لە کۆچکەرو پشتیوانان دەکرد، ئەمەش بە مەبەستی وەرگرتنی ڕاوێژو هەڵوەستەکردن لەسەر ڕاکانیان.

عومەری کوڕی خەتابیش (خوا لێی ڕازی بێت) هیچ کارێکی مەزنی نەدەبڕاندەوە، بێ ڕاوێژی هاوەڵانی، بەڵکو ئەم سەرکردە کارگێڕە مەزنە زۆر سوربوو لە بەشداریکردنی خەڵکی لە فەرمانڕەوایی، هۆی ئەمەیان لێپرسی فەرمووی: (دەترسم هەڵەیەك بکەم هیچ کەس لە ئێوەش لەترسم قسەم لەگەڵدا نەکات). بنەمای ڕاوێژ نیشانەیەکی بەرچاوە لە کارگێڕی، ئەم بنەمایەش لە توانایدایە کەوا لە کارکەر بکات، بە ئەرێنیو کارا بە ڕۆڵێکی بەرچاو پشکداری لە بەڕێوەبردنی دەستگاکەیدا بکات. هەروەك بەرپرسان لە بەڕێوەبردنی ڕێکخراوی کارگێڕی ئیسلامی والێدەکات پابەندبن پێوەی وەك سەپێندراوێکی خوایی، کە خستویەتییە سەر کۆمەڵگەی موسوڵمانان، وەك شێوازێك تاکی کارکەر بەشدار بکات لە وەرگرتنی بەرپرسیاری کارگێڕی، کە هانیان بدات لە کارکردنو ڕەنجدانو بەخشین.

هەڵبەت ئیسلام چۆنیەتی دیاریکردنی شێوازی بەشداریکردنی لە لایەن کارکەران لە فەرمانڕەواییو کارگێڕیدا بۆ کۆمەڵەی موسوڵمانان جێهێشتووە، بەو جۆرەی لەگەڵ سروشتی کارو قەبارەو ڕەوشتی دەوروبەری ڕێکخراوەی کارگێڕی بشێت.

لەبەرئەوەی کۆمەڵەی کارکەران لە هەر ڕێکخراوێکی کارگێڕیی ئیسلامی بە باوەڕو ڕەفتار پابەندن بە ئیسلام، بۆیە ئەگەری ناکۆکی دەسەڵاتی نێوان گەورە سەرکردە کارگێڕییەکانو نێوانی کارکەرانی تر شتێکە ڕوودانی ئەستەمە، چونکە هەمووان پابەندن، هەمویان کار بۆ بەرژەوەندی گشتی ئیسلامی دەکەن، مەبەستو ئامانجی خۆیەتی بۆ کۆمەڵەیەك نییە، کە لەگەڵ ئامانجی کۆمەڵەیەکی تری کارکەران جیاواز بێت، بۆیە بابەتی بەشداریکردن بەرهەڵستی سەرکردە کارگێڕییەکانی لێنابینرێت، وەك ئەوەی لە ڕێکخراوە کارگێڕییە هاوچەرخەکاندا دەبینرێت، کە هێزە جیاجیاکان لە پێناوی فراوانکردنی چوارچێوەی ئەو دەسەڵاتانەی پێیان دراوە، ململانێ دەکەن.

ئەمەش لە ڕێکخراوی کارگێڕیی حکومیو لە ڕێکخراوی کەرتی تایبەت پەسەندە، چونکە ئامانجی ڕێکخراوی بازرگانیو پیشەسازییە تایبەتەکان لە وڵاتی ئیسلامیدا لە ڕووی چەمكو پیادەکردن، لە وڵاتی پیشەسازیی هاوچەرخی نائیسلامیدا جیاوازە.

دەستگەی پیشەسازی تایبەت لە ئیسلام ئامانجی زیادکردنی بەرهەمهێنان نییە، لە پێناو زیادکردنو گەورەکردنی دەستهاتی خاوەنکارو کارکەران، زەنگینی بەرهەمهێنانی بێ سنورو دەوڵەمەندبوونی نابەجێو خەزنکردنی زێڕو زیو لە ڕەفتاری ئیسلامی نین. ئابووری ئیسلامی بنەمای زیادکردنی دەستهاتی تاكو دەستهاتی نەتەوەی بێ کۆتایی ڕەت دەکاتەوە، لێرەدا جیاوازی نێوان ئابووری ئیسلامیو ئابووری وڵاتە پیشەسازییە نوێیەکان دەردەکەوێت، هەروەك ئابووری دووەمیان ئامانجی زیادبوونی بێ برانەوە لە دەستهاتی نەتەوەیو دەستهاتی تاك بێوەستان.

پێوەری پێشکەوتنو پەرەسەندنو گەشەپێدان لە وڵاتی ئیسلامی پێوەری کەرەستەیو زیادبوونی کەرەستەیی نییە، بۆیە لە سیستەمی ئیسلامیدا خاوەنکار ئارەزووی زیادبوونی دەستهاتی نییە لەسەر مافی کارکەران، کارکەرانیش لە ڕێگای فشارو ململانێومانگرتن بۆ زیادکردنی دەستهاتو جیاوازییەکانیان لەسەر مافی کار، کارناکەین، بەڵکو سەرجەمیان بۆ ڕەخساندنی ڕادەیەکی گونجاو لە پاراستنو مسۆگەریی کۆمەڵایەتی بۆ کارکەر کۆشش دەکەن.

لێرەدا دەبینین، کە هیچ سیمایەکی ناکۆکیو ململانێ لەسەر دەسەڵات لە ڕێکخراوی کارگێڕیی ئیسلامیدا بوونی نیە، جا ڕێکخراوەی حکومی گشتی بێت، یا ڕێکخراوی کەرتی تایبەت. لەبەرئەمە، لە ئیسلامدا هەمووان بڕوایان بە بنەمای ڕاوێژو بەشداریکردن وەك شێوازێکی کارگێڕی ساغ لە ڕێکخراوی کارگێڕیی ئیسلامیدا هەیە، هەموشیان بڕوایان بەوە هەیە، کە خاوەنکار ماف گەلێکی زانراوو بۆ کارکەریش ماف گەلێکی زانراو هەیە، وڵاتی ئیسلامیش بەردەوام چاودێری ئەم پەیوەندییە دەکاتو ڕێکیدەخات.

### بەندی سێیەم: چاودێری کارگێڕی

**- چاودێری پێشوەخت و چاودێری داهاتوو:**

چاودێری هەیە پێش دەرکردنی بڕیارەکان ئەنجام دەدرێت، ناودەبرێت بە چاودێریی پێشوەخت، چاودێریش هەیە دوای ئەمە ئەنجام دەدرێتو ناویش دەبرێت بە چاودێری داهاتوو. چاودێری پێشوەختیش لەسەر پرۆژە بڕیار لە لایەنی چاودێران لە ڕێکخراوی کارگێڕی دەپشکێنرێت، بە جۆرێك دەتوانن دوای ئاسوودەبوون، ڕەزامەندی ڕابگەیەنن، لە درووستی زانیارییەکان، ساغیی بە لگەنامە پەیوەندارەکان بە بڕیار، یا دەرخستنی نارەزامەندییان لەسەر پرۆژەو بڕیارەکان ڕوودەدات، بە ئامانجی پشکنینی ئەو بڕیارانەو گرتنەبەری ڕێو شوێنی شیاو. ئامانجی چاودێری کارگێڕی، دڵنیابوونی تەواو ڕێزگرتنی بنەمای ڕەوایە سەبارەت بە سەرجەم کارە دەرچووەکان لە ڕێکخراوی کارگێڕی ناناوەندی لە لایەك ولە لایەکی تر کۆشش دەکات بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندی گشتی، کە خۆی لە خودی بەرژەوەندی وڵاتو بەرژەوەندی دەستە ناناوەندییەکانو بەرژەوەندیی هاوڵاتییان دەبینێتەوە.

چاودێری کارگێڕی بریتییە لە چاودێری بەسەر ئەندامان لە لایەكو چاودێری بەسەر کارەکان لە لایەکی تر.

چاودێری لەسەر ئەندامان مافی نوێنەر لە دامەزراندنو تەمێکردنی هەندێك هەڵسوڕێنەران بە بەڕێوەبردنی ئەم ڕێکخراوو دەستانەو دەرکردنی ڕێنماییو وەرگرتنی ڕاکانیان، ئامادەبونی دانیشتنەکانی ئەم دەستانە، ڕاگرتن، یا هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنەکانی کارگێڕیی دەستە ناناوەندییەکان، دەگرێتەوە.

کردەی چاودێری کارگێڕیش لەسەر ڕێکخراوە ناناوەندییەکان، تەنها لە چاودێری بەسەر ئەندامان لە کارەکاندا ناوەستێت، بەڵکو بۆ چاودێری بەسەر جێبەجێکردنی ئەم کارانەش درێژ دەبێتەوە، لە ڕێگەی ئەو یارمەتییە داراییو هونەریو کارگێڕییانەی، کە دەسەڵاتی چاودێری لە ماوەی قۆناغی جێبەجێکردندا پێشکەش دەکات.

# ٥٠٠ بیرۆکەی قەشەنگ بۆ ڕێکخستنی هەموو شتێک

## چاکترین شێوازو کەرەستە بۆ ڕێکخستنی ژیانت، لە ئۆفیس‌و ماڵ، لە کاتی خوێندن‌و کارو سەفەرو بازاڕدا...

ن: شیری بایکۆسفی..
و. بۆ عەرەبی: محمد عنان..
و. بۆ کوردی: زانکۆ قەرەداغی

٥٩- لە خاڵی ٥٩ی ژمارەی ڕابردوودا باسمان لەوە کرد کە بە چەند ڕێگەیەك دەتوانیت سوود لە دەفتەری ناونیشان وەربگریت، لەوانە:

أ- دەتوانیت وەك فەرهەنگۆکێك سوودی لێوەربگریت، کە خۆت وشەو ماناکانی تیابنووسی‌و بە پێی پیتەکان وشەکانی تیا ڕێکبخەیت.

ب- وەك دەفتەری پلان بۆ پرۆژەکانت بەکاریبهێنیت‌و بەرامبەر هەر پرۆژەیەك ئەو بیرۆکانەی تیا تۆمار بکەیت کە دێت بە خەیاڵتدا.

ج- تێبینی سەبارەت بەو شوێنانە تیا تۆمار بکە، کە دووبارەو چەندبارە سەردانیان دەکەیتەوە.

**٦٠- ساڵ دوای ساڵ:**

پێش هاتنی سەری ساڵی نوێ، تەواوی بەرواری ئیش‌و کارو ڕووداوە گرنگەکان لە دەفتەرە نوێکەتدا بنووسەرەوە، لانی کەم بۆ ئەم بەروارانە ڕەنگێکی تایبەت بەکاربهێنە، کە ئەمەش یارمەتیت دەدات، ئیش‌وکارەکانی کە بۆ سەر ئەم دەفتەرەت گواستۆتەوە، بە ئاسانی بناسیتەوە، لەو بەروارە گرنگە دانانی باج‌و تۆمارکردنەوەی ساڵانەی ئۆتۆمبێل‌و تازەکردنەوەی مۆڵەتی شۆفێری‌و بۆنەو پشووەکان‌و کاتی گەشت‌و گوزارو سەفەرەکانت‌و کۆنگرەی ساڵانە، چەندین بۆنەی دیکە..

**٦١- نیشانەیەك بۆ هەر ڕۆژێك:** ئەگەر دەفتەری دیداری ڕۆژانە، یان هەفتانە، یان مانگانە، هەر کامیانت بەکارهێنا، ئەوا بۆ ئەو ڕۆژەی ئیش‌وکارت نیشانەیەکی دیار دابنێ، تا ناچار نەبیت هەموو جارێك بۆ پەڕەی ئەو ڕۆژە بگەڕێیت، دەتوانی بە خەتێکی خۆش‌و ناسك، ئەو نیشانەیە دابنێیت‌و دەفتەرەکەت نەشێوێنیت.

**٦٢- سبەینێ چیمان هەیە:**

بۆئەوەیە لە گرفتی درەنگ خەوتن، یان نارێك‌وپێکی جل‌وبەرگ ڕزگارت بێت لە کاتی دیدارێکی گرنگدا، ئەوا پێش خەوتن چاوێك بە دەفتەری دیدارەکانتا بخشێنەوە، بەیانیش پێش لە ماڵ دەرچوونت چاوێکی تری پیابخشێنەوە.

**٦٣- لە پێشدا هۆشدارییەك:** ئەجەندەی کاتی دیدارەکانت بەکاربهێنە، تا کاتی دیدارەکانت یادی خۆتی بهێنیتەوە، بۆ نموونە ئەگەر تێبینییەکت بەرچاوکەوت نوسرابوو: (ڕاپۆرتەکە ئامادەیە)، ئەوا پێش ئەوە تێبینییەك دەبینیت نوسراوە (ڕاپۆرتەکە بنووسە)، کاتێك تێبینییەك دەنوسیت (ژمێریارەکە بانگ بکە)، ئەوا دوای ئەوە تێبینییەکی تر بنووسە: (ئامادەکردنی داتاو ژمارەکانت) تا بیری ژمێریارەکەی بهێنیتەوە، کۆشش بکە کاتی تەواو بۆ ئەم کارە گرنگە دابین بکە.

**٦٤- دۆسییەکانی جموجوڵ:**

دوانزە دۆسییە ئامادە بکە، هەر یەکەیان بۆ مانگێك‌و لەم مانگەوە دەستپێبکەو ئەو شتانەی تیادا دابنێ کە پێویستە بەدواداچوونیان بۆ بکەیت، وەك کۆپی یادەوەری‌و نامەکانت‌و ناوی ئەو کەسانەی کە دەبێت قسەیان لەگەڵدا بکەیت، ئەو کتێبانەی کە پێویستە بیانکڕیت، لە هەر دۆسییەیەکدا ئەو شتانە دابنێ کە لە ڕووی کاتەوە لەگەڵیدا دەگونجێت، بەڵام کۆپی ئەسڵ لەم دۆسیانەدا دامەنێ، چونکە شوێنی کۆپییە ئەسڵیەکان دۆسییە هەمیشەییەکانن، دوای تەواوبوونی ئیش‌وکاری هەر مانگێك دۆسیەی ئەو مانگە لەناوبەرە، دوای گواستنەوەی هەر ئیشێك کە لە دۆسییەی ئەو مانگەدا هەبووە تەواو نەکراوە بۆ دۆسیەی مانگێکی تر.

**٦٥- هەمیشە گواستراوە:**

بەکارهێنانی دەفتەری ڕۆژانەی گەورە بۆ ئەو کەسانە بەسوودەو دەگونجێت کە ئیش‌و کاریان لە ١٠٠٪ لە ژیانی تایبەتی خۆیان جیایە، ئەمە لە کاتێکدا کە ئەو دەفتەرانەی بۆ ڕێکخستنی ژیانی تایبەتی‌و ئەجەندەی دیدارەکان بەکاردەهێنرێت جۆراوجۆرو جیاوازن.

تۆ لە نووسینگەکەتدا دەتوانیت قەبارەی دەفتەری ئیش‌وکاری ڕۆژانەت

دوو بەرابەر زیاد بکەیت، بە دانانی پەڕەی نوێ تێیدا، چونکە ئەو دەفتەرانە کار ئاسانی ئەوەت بۆ دەکەن کە پەڕەی زیادەیان تێدا دابنێیت، ئەگەر ویستت ئەجەندەی دیدارەکانت، یان لیستی هەر ئیشو کارێك بە بەردەوامی لەبەردەمتدا بێت، ئەوا دەتوانی ئەو پەڕانە لە دەفتەرەکە دەربهێنیو لەسەر هەڵگرێکی تایبەت لەسەر مێزەکە دایانبنێیتو لە کۆتایی دەوامیشدا لەگەڵ خۆت بیانبەیت.

**٦٦- لە دەرەوەی شار:**

ئەگەر لە دەرەوەی شار چاوپێکەوتنێکی تایبەتی خۆت، یان پەیوەست بە ئیشو کارەکانتەوە هەبوو، ئەوا لە ڕێی تەلەفۆنەوە پەیوەندییان پێوە بکە، دواتر کاتی دیدارەکە لە یادنامەکەتدا تۆمار بکە، بۆئەوەی بتوانی لە کاتی خۆیدا ئامادە بیت، یان ڕەتی بکەیتەوە، بێئەوەی چاوەڕێی پەیوەندیکردنی کەسی بەرامبەر بیت.

**٦٧- جەختکردنەوە لەسەر دیدارێکی پێویست:**

ئەگەر پابەندبوویت بە دیداری پێویستەوە لە کاتێکی دیاریکراودا، ویستت پێشوەخت لە کاتو شوێنی دیدارەکەت دڵنیابیتەوە، ئەوا لە دەفتەری دیدارەکانتا نیشانەیەك بەرامبەر ئەو دیدارە دابنێو ژمارە تەلەفۆنەکەشی بەرامبەری بنووسە.

**٦٨- ڕەنگە ببێو ڕەنگە نەبێت:**

لە کاتی بوونی دیدارێکدا کە زۆر لە ئەنجامدانی دڵنیا نەبیت، ئەوا کاتو شوێنی ئەو دیدارانە لە دەفتەری دیدارەکانتدا بە قەڵەم ڕەساس تۆمار بکە، تا بتوانیت لە کاتی هەڵوەشانەوەی دیدارەکەتدا لە دەفتەرەکەتدا بیسڕیتەوە، ئەگەر دڵنیاش بوویت کە دیدارەکەت جێبەجێ دەکەیت، ئەوا دەتوانیت بازنەیەك بە دەوریدا بکێشیت.

**٦٩- دوو دەفتەری ئەجەندە:** ئەگەر هیچ تێکەڵیو تێهەڵکێشییەك لە نێوان ئیشو کارو ژیانی تایبەتی خۆتدا نەبوو، ئەوا چاکتر وایە دوو دەفتەری ئەجەندەت هەبێت، یەکێکیان لە ماڵەوە تایبەت بێت بە یادەوەرییەکانو کاتی گۆڕینی ڕۆنی ئۆتۆمبێلو گۆڕینی ئەو فلتەرانەی بۆ پاکردنەوەی ئاوی ماڵەکەت بەکاریاندەهێنیتو.... هتد، ئەوی تریشیان لە نووسینگەکەت دایبنێ بۆ کاتی دیدارەکانتو ئەو تێبینییەی لە نووسینگەکەت پێویستت پێی دەبێت، وەك کاتی چوونت بۆ لای دکتۆرو دەتوانیت بۆ دڵنیایی زیاتریش کاتی دیدارو ئیشوکارەکانت لە هەردوو دەفتەرەکەتدا تۆمار بکەیت.

**٧٠- تەنها یەك دەفتەری ئەجەندە:**

ئەگەر وات بە چاکزانی تەنها یەك دەفتەری ئەجەندەت بۆ هەردوو مەبەستی ماڵو نووسینگە بەکاربهێنیت، ئەوا دانەیەك لەو جۆرە بکڕە کە لاپەڕەی ڕۆژێکی تیا دابەشکراوە بە چەند بەشێکەوە، دەتوانیت بەشی سەرەوەی لاپەڕەکە بۆ ئیشو کاری نووسینگەو بەشی خوارەوەش بۆ ئیشو کاری ناوماڵ بەکاربهێنیتو بەهێڵێك لە یەکیان جیابکەیتەوە..

**٧١- یادنامەی ژمارەیی (دیجیتاڵ):**

ئەگەر لە کوژاندنەوەی ئەو ژمارە تەلەفۆنانەی کارت پێیان نەماوەو نوسینی ژمارەی دیکە، یا ن ڕاستکردنەوەی هەندێ ناوو ژمارە تەلەفۆن لە ناو دەفتەری تەلەفۆنەکەتدا بێزار بوویت، ئەوا دەتوانیت سەردانی فرۆشگایەکی ئەلیکترۆنی بکەیتو دەفتەرێکی یادنامەی ژمارەیی (دیجیتاڵ) بکڕیت، کە زۆر مۆدێلی جیاوازی هەیەو دەتوانیت ژمارەیەکی زۆر ناوو ژمارەی تەلەفۆنی بە ڕێگایەکی ئاسان تیادا بپارێزیو هەر کاتیش ویستت دەتوانیت ناوو ژمارەی نوێ تۆمار بکەیت، هەر ناوێکیش ویستت بیسڕیتەوە، یان گۆڕانی تیا ئەنجام بدەیت، ئەمجۆرە یادنامانە قەبارەیان بچووکەو کێشیان کەمەو بە ئاسانی لە گیرفاندا هەڵدەگیرێت، ئەم ئەجەندە ژمارەییانە جۆریان زۆرە: (Rodolex, Sharp, Casio).

**٧٢- ئاستێکی جێبەجێکردنی بەرز:**

ئەگەر یادنامەی دیجیتاڵت بەکارهێناو هەستتکرد، بەڕاستی پێویستە تایبەتییە هەنووکەییەکانت جێبەجێدەکات، بەڵام شان بە شانی فراوانبوونی ئیشو کارەکانت فریاناکەوێت، ئەوا بیر لەوە بکەرەوە کە سوود لە جۆرێکی ئاستبەرزی یادنامەی دیجیتاڵ وەربگریت، کە ئەویش یادنامەی دیجیتاڵی ئیشو کارە، کە لەوی پێشتر بە تواناترو سوکەڵەترە، دەتوانیت بە کراوەیی لەسەر مێزی نووسینگەکەت دایبنێی، هەروەك دەتوانیت کاری ئەجەندەی دیدارەکانیشت جێبەجێ بکاتو ببێتە دۆسییەی کاتی ناونیشانەکانو هاوکات دەفتەری ڕێکخستنی ئیشو کارە تایبەتییەکانی خۆشت بێت.

هەندێ جۆری ئەم یادنامەیە دەتوانیت میمۆری فراوانتر لەوەی خۆی بۆ دابنێیت کە بە هۆیەوە دەتوانیت فەرهەنگی ئەلەکترۆنی لە بوارەکانی زمانەوانیو یاساو داراییو پزیشکی تێدا بەکاربهێنیت، ئەمە جگە لە خشتەی زانیاری تر.

زۆربەی جۆرەکانی ئەم یادنامەیە دەبەستریت لە کۆمپیوتەرو دەتوانیت لەو ڕێگەیەوە داتاو زانیارییەکانی ناوی چاپ بکەیت، چاکتر وایە هەمیشە ئەو زانیارییە گرنگانەش کە لە یادنامەکەدا هەن، لەسەر (CD)یەك تۆمار بکەیتو بپارێزیت، بەکارهێنانو سوودوەرگرتن لەم ئامێرە کارێکی گران نییەو شیاوی فێربوونە.

## گەرماو..

**٧٣- شپرزەیی ژووری ساردی گەرماو:**

ئەگەر ژووری گەرماوەکەت نارێکو شپرزە بوو، ئەوا بە تەواوی ڕێکی بخەو هەر شتێك کۆن، یان ئێکسپایەر بووە، یان ساڵی تێپەڕاندووە فڕێیان بدە، وەك مەعجونو ئەو شتانەی کە بۆ گەرماو بەکاردەهێنرێت.

**٧٤- هەرجارەو دانەیەك:** ئەگەر کۆمەڵێك کەرەستەی کەڵەکەبووت هەبوو، هەمووشیان بەکارهاتووبوون، ئەوانەی کە نیازی پێیان نەماوە فڕێیان بدە، ئەوانەی تر پۆلێن بکە بەپێی جۆرو ڕەنگ، ئەگەر دووبارە بوو، یان لە یەکچووی تێدابوو، بەدوای یەکدا بەکاریانبهێنە هەرجارەی دانەیەك، تا لە هەر جۆرەو یەك دانەت دەمێنێت، لە یادیشت نەچێت لە دوای بەکارهێنانیان هەر شتەو بخەرەوە شوێنی خۆی.

**٧٥- ڕەفە (جێ سابوون) نزیك دووشی گەرماو:**

پێویستە لە هەموو گەرماوێکدا جێ سابوونێك نزیك دوشەکە هەبێت، جۆرێك ڕەفە هەیە، کە لە تەڵێکی ڕەقی کانزایی دروستکراوەو بە پلاستیك داپۆشراوەو چەند قاتێکە، بەهۆی گیرەی لاستیکییەوە لەسەر دیواری گەرماوەکە جێگیر بکرێت، لەم جۆرە ڕەفەیەدا جێگەی تایبەت هەیە بۆ سابوونو شامپۆ... پێویستییەکانی دیکە..

بەشی
هەشتەمو کۆتایی



# ڕۆڵی حکومەت لە دروستکردنی کارگێڕی ئیلکترۆنی

ئا: نەریمان بەهرام

**٤-٣ ڕۆڵی حکومەت لە دروستکردنی کارگێری ئیلکترونیدا:**

سەبارەت بە ڕۆڵی حکومەت لە دروستکردنی کارگێڕی ئیلکترۆنیدا، بەڕێز (سامان خضر) وتی: لەم بوارەدا حکومەت بایەخێکی زۆر گرنگی هەیە، لەبەرئەوەی حکومەت توانای ئەوەی هەیە پێداویستییەکانو کارمەندانی ئەم بوارە دابین بکات، هەروەها بەشێکی باشی لە دەزگاکانی حکومەت پاش پرۆسەی ئازادی عێراق هەم لە لای حکومەتەوە هەم لە لایەن کۆمپانیاکانەوە لە ڕێگەی تۆڕی ئینتەرنێتەوە بە یەکترییەوە ببەستنەوە، ئەمەش وادەکات کارەکان بەخێرایی بەڕێوەبچن، بە کەمترین نرخ، بەگونجاوترین شێواز، هەربۆیە ئەرکی حکومەتە کار بۆ پەرەپێدانی ئەم لایەنە بکاتو پێداویستییەکانی دروستبوونی کارگێڕییەکی تۆکمەو بەهێز دروست بکات لە کوردستاندا، کە بتوانێت ئێمەش وەکو وڵاتە پێشکەوتووەکانی دیکە، کارەکانمان بەخێراترین شێوەو بە کەمترین تێچوون ڕابپەڕێنین، کە سەرەنجام قازانجی حکومەتو هاوڵاتی لێدەکەوێتەوە، هەروەها کاربکرێت بۆپەروەردەکردنی کادیری لێهاتوو بە تواناو بڵاوکردنەوەی هۆشیارییو شارەزاکردنی هاوڵاتیان بە شێوازی بەکارهێنانی ئەم سیستەمە نوێیە لە هەموو دامو دەزگا حکومیو ناحکومییەکاندا، هەروەکو وتمان هەموو پێشکەوتنێك لایەنی باشو خراپی هەیە، بۆیە پێویستە لەسەر هەمووان کاربکەین لەسەر پەرەپێدان بە لایەنە باشەکانی تەکنەلۆژیاو کارکردنو تێکۆشان بۆ لەناوبردنو نەهێشتنی لایەنە خراپەکانی، هەروەك دەڵێن تەکنەلۆژیا بەتایبەتی ئینتەرنێتو کۆمپیوتەر جیهانی کردووە بەگوندێکی بچووك، دەبا ئێمەش کارێك بکەین لەم بوارەدا، تائێمەش کوردستان بکەین بە گوندێکی بچووك، یاخود گوندێکی شوشەیی کەپەیوەندییەکی بەهێز سەرتاپای دامودەزگاکان حکومیو ناحکومییەکان بگرێتەوە، بۆخزمەتکردنو ئەوپەڕی کارئاسانکردنی بۆ هەموو تاکێکی کورد لە هەر شوێنێکی ئەم جیهانەدا.

دەرەنجام:

لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا بە چەند دەرەنجامێك گەیشتین کە کارگێڕی ئیلکترۆنی لایەنی ئەرێنی زۆری هەیە، لە هەمانکات لایەنی نەرێنیشی هەیە، لایەنە ئەرێنییەکانی ئەمانەی خوارەوەیە:

١- گەیاندنی زانیارییەکان بۆ سەرجەم دامودەزگاکانی دەوڵەت بەخێراییەکی زۆر ئەنجام دەدرێت.

٢- کارگێری ئیلکترۆنی باشترین شێوازە بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانی دامودەزگاکانی حکومەت.

٣- ئاسانکردن و ڕاپەڕادندنی کارەکانو کەمکردنەوەی ڕۆتینو لابردنی هەنگاوە زیادەکان.

٤-پێویست بە هەڵگرتنی فایلو دۆسییەو کاغەز ناکاتو شوێن کەمتر داگیر دەکات، واتە سیستەمەکە بێ پەڕەیە (Paperless system)

٥- کەمکردنەوەی ڕۆتینو نەهێشتنی گەندەڵی کارگێڕی.

٦- خێرا ڕاپەراندنی کارەکانی حکومەتو هاوڵاتیان لە ماوەیەکی زۆرکەمدا.

٧- کەمی تێچوونو کاغەزی کەمی پێویستە.

٨- کاتێکی کەمی دەوێت.

**گرفتی پیادەکردنی ئەم سیستەمە:**

١- پێویستی بە هێڵی خێرای (ئینتەرنێت) هەیە کەتا ئێستا ئەم هێڵانەی کە لە کوردستاندا هەیە، بە شێوەیەکی ئەو تۆ نییە کە بگونجێت لەگەڵ کارگێڕی ئیلکترۆنی.

٢- نەبوونی ژێرخان لە ڕووی پەیوەندی تازەو هاوچەرخی بەرز، یا گونجاو بۆ پەیوەندیکردنو گۆڕینەوەی

داتـــا، چ بە هۆی وایەر، یان وایەرلێس، (واتە نەبوونی تۆڕی پەیوەندی پێشکەتوو).

٣- نەبوونی ئاسایشی ئیلکترۆنی، یان (السریە الالکترونیە)ی بەرز، بۆ پاراســتنی نهێنییەکانی خەڵکی، یـــان حکومەت، چونکە ئەم لایەنە ترسناکە لە ڕووی بڵاوبوونەوەی زانیاری.

٤- پێویستی بەکارەبای بەردەوام هەیە، چونکە هەموو کارەکان بە کارەبا دەکرێت، ئەمەش جێبەجێکردنی لە کوردستاندا گرانە.

٥- لەناوچوونـــی زانیارییـــەکان بە هۆی هاك کـــردن، یان بە هۆی ڤایرۆسەوە.

٦-پێویستی بە کەسانی شارەزاو لێهاتوو هەیە.

٧-پێویســـتی بە (کۆمپیوتەر) هەیە کە توانایەکی باشی هەبێت لە جێبەجێکردنی کارەکاندا، واتە مواسەفاتی زۆر بەرز بێت.

**پێشنیار:**

١- دەبێـــت حکومـــەت یەکـــەم کاری بۆ دروســـتکردنی سیســـتەمی کارگێڕی ئیلکترۆنی، کارەبای بەردەوام دابین بکات، بەبێپچران.

٢- لـــە قۆناغەکانـــی خوێنـــدن وانەیەك لە وانـــەکان تایبەت بێت بەئیلکترۆنی، واتە بۆئەوەی نەوەیەکی نوێی شارەزا لەم بوارە گرنگەدا دروست ببێت.

٣- مەشـــق پێکردنی کارمەندانـــی حکومەت، بۆئەوەی شـــارەزایی تەواویان هەبێت لەم بوارەدا.

٤- دابینکردنـــی بوودجەیەکـــی تـــەواو بـــۆ کڕینـــی ئامێـــرە ئیلکترۆنییەکان.

٥- دابینکردنی هێڵێکی خێرای ئینتەرنێت لە کوردستان.

٦- هێنانی کەسانی پســـپۆڕو شارەزا لەم بوارەدا، بۆئەوەی ڕاهێنان بە کارمەندانی کوردستان بکەن.

٧- دامەزراندنـــی دەرچـــووی کۆلیژەکانـــی کۆمپیوتـــەرو (IT)، کارپێکردنیان لە بواری کارگێڕی ئیلکترۆنیدا.

٨- کارپێکردنی کارمەندان بە ئامێرە ئیلکترۆنییەکان بە شێوەیەکی فەرمی.

٩- ناردنەدەرەوەی کارمەندان (فەرمانبەران) بۆ وڵاتانی شارەزا لەم بوارەدا، وەك بەریتانیاو ئەمریکاو یابان ...هتد.

١٠- بە ئیلکترۆنی کردنی وەزارەتێك، بۆ نموونە کە کارەکانی ئاسان بێت، وەك وەزارەتی پەروەردە، یان وەزارەتی خوێندنی باڵا.

**سەرچاوەکان:**


١-پەرتووکی قورئانی پیرۆز (تەفسیری ئاسان).

٢- پەرتووکـــی (بەڕێوەبردنـــی تەکنەلۆژیای زانیـــاری)،(ن. ئەنوەر نجم دین).

٣-پەرتووکـــی (کۆمپیوتـــەرو زمانـــی بێســـك)، (ن. نـــزار ابراهیم محمد).

٤- پەرتووکی (yahoo massager)،(ئا.هێوا سالح قادر).

٥- پەرتووکـــی (ئینســـایکلۆپیدیای ئینتەرنێت)،(هێمن مەلا کەریم بەرزنجی).

٦- پەرتووکی گیرفانی (میدیای ئینتەرنێتو گرفتە یاساییەکانی)،(ن. سامان فەوزی، و. هونەر رەسول).

٧- پەرتووکی (إدارة الوقت)،(الاستاذ دکتور ربعی مصطفى علیان).

٨- پەرتووکی (فن إدارة الوقت والإجتماعات)،(سلیم و سامی»محمد هشام»حریز).

٩-پەرتووکی (الإدارة الإلکترونیة)،(دکتور/نجم عبود نجم).

١٠-پەرتووکـــی (إقصاءیات الحمـــل)،(د. محمد طاقە) و (د.حســـین عجلان حسن)

١١- پەرتووکی (الاعمال الالکترونیة)،(د.سعد غالب یاسین و د.بشیر عباس العلاق).

١٢-پەرتووکی (نظریة المنظمة والتنظیم)، (الاســـتاذ دکتور محمد قاسم القریوتی).

١٣- پەرتووکـــی (مبادئ الإدارة مع الترکیـــز على إدارة الاعمال).(د. خلیل محمد حسن الشماع).

١٤-پەرتووکی (النظام المعلومات الإداریة)، (د. بشار یزید الولیە).

١٥- گۆڤاری (ئۆزۆن)،( ئا.موهەند ئەیوب).

١٦- گۆڤاری (بڕیار) ، ژمارە (٩، ١٤).

http://www.al-jazirah.com.sa/digimag/23042006/hasebat4.htm17-

http://www.hrm-group.comvbshowthread.phpt=14719

http://www.arabtron.com/pageprint.php?id=7378

www.alsabaah.com

www.awro.org


**فەرهەنگ**

| ئینگلیزی | عربی | کوردی |
|---|---|---|
| E-management | الإدارة الالکترونیة | کارگێڕی ئەلکترۆنی |
| Management | الأدارة | کارگێڕی |
| Leader ship | القیادة | سەرکردایەتی |
| Computer | حاسبة | کۆمپیوتەر |
| Internet | انترنت | ئینـتـەرنێت |
| Networks | الشبکات | تـۆڕەکان |
| Information | المعلومات | زانیاری |
| Information center | مرکز المعومات | بنکەی زانیاری |
| Human Cadre | الکادر البشري | کارمەندی مرۆی |
| Communication | اتصال | گەیاندن |
| Accountable | مسؤلیة | بەرپرسیارە |
| E-Government | الحکومة الکترونیة | حکومەتی ئەلکترۆنی |
| Address | العنوان | ناونیشان |
| Organizing | التنظیم | ڕێکخستن |
| Directing | التوجة | ئاراستە کردن |
| Controlling | الرقابة | چاودێری کردن |
| Planning | التخطیط | پلاندانان |
| Paperless system | نظام اللاورقیة | سیستەمی بێ پەرە |
| Organization | تنظیم ، مؤسسة | ڕێکخراو ، دامەزراو |
| Design | تصمیم | نەخشەکێشان |
| Effectiveness | فاعلیة | چالاکی |
| Operation | تشغیل ، عملیة | خستنەگەڕ ، کردار |
| Process | مرحلة ، طور ، عملیة | قۆناغ ، دۆخ ، کردار |



و: گۆران جەمیل

# کەڵەشێرو بەرەبەیان

ئاریان بەیانی زوو لە خەو هەڵسا، کەڵەشێرە سورەکەی گرتو قاچەکانی بەباشی بەستو خستییە ناو سەبەتەیەکەوەو بەرەو شار بە ڕێکەوت..

لە بازاڕی پەلەوەرفرۆشەکاندا سەبەتەکەی داناو چاوەڕوانی کڕیارێکی دەکرد.

هەرکات کەسێك لێی نزیك دەبووەوە، تەماشایەکی کەڵەشێرەکەی دەکردو پاشان پرسیاری نرخەکەی، پاش ئەوەی لەگەڵ (ئاریان)دا ڕێکنەدەکەوتن، دەڕۆیشتو دووردەکەوتەوە.

کەڵەشێرەکە لە دەروونی خۆیدا وتی: کەوا بوو ئاریان دەیەوێت بمفرۆشێت.

دەستیکرد بە جولەجوڵو هەوڵدان بۆ خۆدەربازکردن لە ناو سەبەتەکە، بەڵام هەوڵەکانی بێئاکام بوو، توانای ئەم کارەی نەبوو.

بە توڕەییەوە وتی:

چۆن بە (شار)دا هەڵدەدن لە کاتێکدا من جگە لە بەندبوون، هیچی ترم تێدا نەبینیوە.

بیری لە گوندەکەیان دەکردەوەو خەیاڵی بۆ لای ئازادییەکەی دەفڕی، لەبەرخۆیەوە دەیگوت: خەڵکی گوندەکەم ئارام ناگرن لە سەر دوورکەوتنەوەی من لێیان، من هەموو بەیانییەك لەخەو هەڵیان دەسێنم.

پیاوێکی خەڵکی دێکەی ئاریان هاتو لە پاش سڵاوکردن وتی:

- ئەوە چی دەکەیت لێرە؟

+ دەمەوێت ئەم کەڵەشێرە بفرۆشم.

- من لێت دەکڕم.

پیاوەکە کەڵەشێرەکەی کڕیو بردییەوە بۆ گوندەکە، کەڵەشێرەکە بە دڵخۆشییەوە وتی:

من زانیم کە گوندەکەم قبوڵ ناکەن من لێیان دوورکەومەوە، بۆیە بە هەر نرخێك بێت دەمگێڕنەوە بۆ لای خۆیان، بۆ ئەوەی سپێدەیان بۆ وەدەرخەم. کاتێك کە گەشتنە ناو ئاواییەکە، کەڵەشێرەکە توشی سەرسوڕمان بوو، بینی واخەڵکی لە خەو هەستاونو خۆریش هەڵهاتووە. کەڵەشێرەکە مریشکێکی بینیو لێی پرسی:

- ئەمڕۆ چۆن خۆر هەڵهات؟

+ هەروەك هەموو ڕۆژەکانی تر.

- بەڵام من لە گوندەکە نەبووم.

+ لە گوندەکەدا سەدان کەڵەشێری تر هەیە.

کەڵە شێرەکە بە شەرمەزارییەوە وتی:

-من لەو بڕوایەدا بووم کە جگە لە من کەسی تر نییە!

مریشکەکە وتی:

+ ئەو بیرکردنەوەیە هەمووی لوتبەرزییە.

لە کۆتایی شەودا کەڵەشێرەکەی ئاریان هاتەدەرەوەو جێگایەکی هەڵبژارد، گوێی لە قوقەی کەڵەشێرەکان بوو کە لە هەموو لایەکەوە بەرزدەبوونەوە، کەڵەشێرەکە هەردوو باڵی دا بەیەکداو ملی هەڵبڕیو بە دەنگی بەرز قوقاندیو دەنگی تێکەڵ بە دەنگی کەڵەشێرەکانی تر کرد.. پاشان شەبەقێکی جوان هەڵهات.

سەرچاوە: حکایات قبل النوم

هاژە شێروانی
بەشی یەکەم

# بەرپرسیارییەتی ئامادەکردنی ڕۆڵەکانمان بۆ بازاڕی کار

ئەم سەردەمەی تیایدا دەژین کە ناسراوە بە دابەزینی ئاستی ئاکار، لە دەرەنجامی بەجێهێشتنی پیشەی پەروەردەییە بۆ خزمەتکار، ناوماڵ، هاوڕێ، کەناڵەئاسمانییەکان، شەقامەکان، دەبینین هەتاوەکو خاوەنکارەکانو کارگەکانیش دوودڵن لە دامەزراندنی لاوەکانمان، چونکە ڕوانینێکی خراپیان لەسەر لاوەکان لەلا دروستبووە، ئەگەر ئاوا بەردەوام بێت ئەوا گرفتی بێکاری کەڵەکە دەبێت، هەربۆیە پێویستە لەسەرمان هەر لە ئێستاوە بە ڕۆڵی سەرەکییان هەڵبستین. هەروەك لە ئاکارە سەرەکییەکانی کاریش بە نموونە ڕێکخستن، ڕێککاری، کۆششکردن، وردی لە کارکردن، بەئاگایی، نەرمونیانی لە مامەڵەکردن، خودڕێککردن، کە هەرواو لە خۆڕا پێناگات، بەڵکو لە ڕێگای فێرکردنو مەشقکردن وەردەگیرێت، گرنگتریش ئەوەیە کە هەمیشە نموونە بین لە هەڵسوکەوتو ژیانی ڕۆژانەمان، لێرەشدا هەوڵدەدەین کە لە ماڵەوە دەستپێبکەین بە خستنەڕوو چۆنیەتی شیکردنەوەی پراکتیزەکردنی ئەو ستراتیژییانەی کە یارمەتیدەرن لەسەر پەرەپێدانی کارامەیی داواکراو لە بازاڕی کار.

باشترینیش کە تا ئێستا لەبەردەممان هەبێت ئەوەیە کە (ڤیکی کارونا)ی پسپۆڕ لە بواری پەروەردەی نوێ پێشکەشی کردووین:

**- سەرنجدانە سەر کوالێتی کار:** بە واتای بەرهەمی کاری باشتر لەوەی کە پێشبینی کراوە، یان ئەوەی کە داواکراوە، بەرلەوەی کە دەست بکەین بە مەشقکردنی ڕۆڵەکانمان لەسەر کوالێتی کار، پێویستە لە خۆمان بپرسین، ئایا ئێمە ئەم سیفاتانەمان هەیە، یان نا؟ چونکە کێشکردنی کارامەییەکان بە تەنها لە فێرکردنو مەشقکردنەوە نایەت، بەڵکو لە ڕێگای تێبینیکردنو لاساییکردنەوەی کەسانی ترە، بەتایبەتیش ئەگەر بەریەککەوتنی ڕۆژانە هەبێت، بە نموونە ئەوەی کە لەگەڵ دایكو باوك ڕوودەدات، لێرەدا (ڤیکی) دەڵێت: لە سیفاتەکانی خاوەن کوالێتی لە کار ئەوەیە کە خاڵی هێزو لاوازی خۆی بناسێت، درك بەوە بکات کە لە ژیانیدا پێویستییەتی بۆ پەرەپێدانیو خۆی بۆ ئامادە بکات، متمانەی بە کوالێتی کارەکەی بێت تا پلەیەك کە ناوەکەی بخاتە سەری بە بێ ترسو دوودڵی.. هەمیشە متمانەی بێت بەوەی ئەوە دەکات کە بەڵێندەدات، کوالێتی کاری کەسانی تریش بەهەند وەردەگرێتو پێیان ڕادەگەیەنێت، ئەمەش دەتوانرێت بناغەکەی لەناو ماڵدا دەست پێبکات لە ڕێگای مەشقپێکردنی ڕۆڵەکانمان لەسەر هەڵبژاردنی باشترین کاڵای سەرەکی، یان کەمالیات، بۆ نموونە بەشداریان پێبکەین لە بڕیاردانی لەسەر کڕینی کاڵایەك بە نموونە: داوایان لێدەکەین لیستێك ئامادە بکەن بەم تایبەتمەندییە داواکراوانەی بەرهەمەکە، لە دواییدا گەلێك جۆری ئەم بەرهەمەیان دەخەینە بەردەمو داوایان لێدەکەین دوو لیست ئامادەبکەن بە تایبەتمەندییە ئەرێنیو نەرێنییەکانی هەر جۆرێکیان، لەسەر ئەم بنەمایەو دەرەنجامەکەی کاڵایەکە دەکڕین.

**- پشت بەخۆبەستن لە کار:** بە واتای باشترینی پێشکەش بکەین کە

هەمانە لە کاتی ئەنجامدانی کار بە بێ پێویستی بوون بە چاودێر، یا تێبینەر، لە ڕێنماییەکان دڵنیا دەبینەوە تا بەدحاڵیبوون ڕوونەدات، سەرنجدانەکار لەبری ئەوەی چاودێری ئەوە بکەین کە کەسانی تر دەیکەن، بەرپرسیاریەتی لە کار قبوڵبکە بە دانیان بە هەڵە کاتێك کە ڕوودەداتو پەنا ببرێتەبەر پێشکەشکردنی پاساوهێنانەوە، ئەو کارانە وەربگرە کە تواناداریت هەیە تیایداو دەتوانیت جێبەجێیان بکەیت، جگە لەمانە ڕەت بکەوە، لە کاتی نەتوانینی هەڵسان بە کارێك، دانی پیادەنێین، گەڕان بە دوای دەرفەت بۆ بەکارهێنانی تواناکانو پەرەپێدانی، بواری گاڵتەپێکردنو گومانبردنی کەسانی تر نەدرێت بۆ کەمکردنەوەی ورەمان بۆ گەیشتنی بە ئامانج، کە سەربەخۆییو پشتبەخۆبەستن پێویستی بە خۆبردنە پێشە کە دەتوانین ڕۆڵەکانمانی لەسەر مەشق پێبکەین، لە ڕێگای گفتوگۆکردن لەگەڵیاندا لەسەر چۆنییەتی هەڵسوکەوتکردن لە کاتی ڕوودانی بارێکی دیاریکراو کە پێویستی بە هەڵوێستە، بۆ نموونە نەچوونی بۆ قوتابخانەو کەڵەکەبوونی کارەکانی قوتابخانەی، کە داوایان لێدەکرێت ئەو هەنگاوانە دابڕێژن لەسەر کاغەزێك لە دواییدا گفتوگۆ لەسەر کوالێتی هەر هەنگاوێك بکەن کە ئایا هەڵوێست وەرگرە، یان نا؟!

**- بیرکردنەوەی داهێنەرانە:** هەروەك ناسراویشە کە بیرکردنەوەی داهێنەرانە یارمەتیدەرە لەسەر ناسینی گرفتو لە دواییدا توانای لەسەر چارەسەرکردنی لە ڕێگای دانانی ئەگەرو ناسینی کاریگەرییەکانی، یان دەرەنجامەکانی بەگشتی، بۆئەوەی هانی ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە بدەین، ئەوا پێویستە دووربکەوینەوە لە ڕەخنەی ڕوخێنەر، وەکو ئەمجۆرە بیرۆکەیەشی سەرکەوتوو نییە، هەر بۆیە کاتمان بۆی نییە، خەڵك چیمان پێدەڵێن، ئەمە گرفتی ئێمە نییە، با کاتێکی تر گفتوگۆی لەسەر بکەین، بیرۆکەیەکی کۆنە (کە بڵێیت: ڕۆڵەکەم) لە بری ئەمە باشترە بڵێین کە زۆرباشە، سەرسامم پێی، پێدەچێت تۆ ئەمڕۆ عەقڵت بە شێوەیەکی داهێنەرانە کار بکات، بەڕاستی تۆ بەهرەمەندی، تۆ زۆر بە خێرایی فێردەبیت، ...هتد.

**- بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە:** لێرەدا (ڤیکی) پێداگری دەکات لەسەر گرنگی بنیاتنانی تواناکان لەسەر جیاکردنەوەی نێوان ڕاستگۆییو درۆ، چونکە ئەمە پشکداری دەکات لەسەر سەرکەوتن لە ژیان، چونکە ئەوەی باوەڕمان پێیەتی کە ڕاستییە ئەوا ڕۆڵی گرنگو کارای هەیە لەسەر ڕەفتارەکانو بڕیارەکانی کە دەدرێن، چونکە هەموو ئەوەی دەگوترێن ڕاستی نییەو هەموو ئەوەشی کە دەبینرێت ڕەفتارێکی ڕاستە لە ڕاستیشدا هەروا بێت، بۆ ئەمەش بەڵگە زۆرە، بۆ نموونە مناڵەکانمان ڕۆژانە قەبارەی زۆرو جیاوازیان لە زانیاری دەخرێتە بەردەم لە ڕێگای کەناڵە ئاسمانییەکان، ڕیکلامەکان، ئەو گوفتارو کردارانەی کە کەسانی تر دەیڵێنو دەیکەن لە هاوڕێ، هەتاوەکو ئەو کەسانەی کە بە پێشەنگی خۆیانی دەزانن، لێرەدا ئەگەر توانایان نەبێت لەسەر جیاکردنەوەی لە نێوان ڕاستو هەڵە، ڕاستیو درۆ، ئەوا دەبنە قوربانی ئەو کەسانەی کە یاریان پێدەکەنو بەرەو ئاڕاستەیەکیان دەبەن کە دەستخۆشی لە کۆتاییەکەیان ناکرێت! هەر بۆیە پێویستە بە ئاگابین لە گرنگی پەرەپێدانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە، چونکە ئەمە یارمەتیان دەدات لەسەر پشکنینیو دڵنیابوونو تاقیکردنەوەی زانیارییەکەیە بەر لە قبوڵکردنی، هەر بۆیە پێویستە کە ئامادەیان بکەین بۆئەوەی تواناداربن لە هەڵسان بەم پرۆسانە بە شیکردنەوە، ڕاوێژکردن، ناوبژیکردن، بەکارهێنانی بەڵگە دوای دڵنیابوون لە سەرچاوەکەی، بابەتەکان بخرێتە ژێر ڕکێفی عەقڵ بەر لە هەستو سۆز، بەمجۆرە ڕۆڵەکانمان مەشق پێدەکرێت لەسەر بەردەوامبوون لە گەڕانو پرسیارکردن لەسەرچاوەی هەموو زانیارییەك هەروەك هۆکارو بەڵگەنامەشیان پێشکەش دەکرێت (ئەگەر پێویست بکات)، پرسیارکردنیان فەرامۆش نەکەین، یان لە بەهای کەمنەکەینەوە. ئەمەش هەمووی دەبێت لە ڕێگای گفتوگۆکردن لەگەڵیان لە کاتی سەیرکردنی تەلەفزیۆن، یان دوای خوێندنەوەی هەواڵەکە، یا زانیارییەکە کە لە ڕۆژنامە، یاخود پەرتوکێك، یاخود پەندو وتەی بەنرخ کە بەکاردێت لە لایەن هاوڕێ، ناسیاو، یا کەسە نزیکەکانی.

**- تواناداربوون لەسەر مامەڵەکردن لەگەڵ زانیارییەکان بە کارایی:**

دەستخستنی زانیاری بە کارزانی هەروەك بریتییە لە تواناداری لەسەر مامەڵەکردن لەگەڵیدا، دەتوانین ئەمەش دەستبخەین لە ڕێگای ڕێکخستنی لیستو فایلی پزیشکی، یان ئەکادیمی هەر تاکێکی ناو خێزان، لە ڕێگای تۆمارکردنی ڕووداوەکان، یان کارە گرنگەکان لەسەر ڕۆژمێری مانگانە، کە لێرەدا دەتوانین ڕۆڵەکانمان بەشداری پێبکەین لە پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیاریو ڕێکخستنی لە فایلەکانو تۆمارکردنی ڕووداوەکانی.

**- تواناداربوون لەسەر کارکردنی بە کۆمەڵ:** لەوانەیە لە داهاتوودا منداڵەکانمان ناچاربکەین کە لە شێوەی تیمدا کاربکەن، لە پێناو جێبەجێکردنی پرۆژەیەك بە نموونە، هەربۆیە پێویستە کە ئامادەبن بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانی تر بەبێ ڕووبەڕووبونەوە، هەربۆیە دەتوانین کە مەشقیان پێ بکەین لەسەر ئەمە لە ڕێگای دۆزینەوەی دەرفەتی کاری بە کۆمەڵ لە نێوان خێزان، بۆ نموونە دابەشکردنی بەرپرسیاریەتیو بەشداری پێکردنیان لە پاککردنەوەی باخچە، یان ماڵ، کە لێرەدا دڵنیا دەبین لەوەی کە هەموو تاکێك بە ڕۆڵی خۆی هەڵساوە، فشاریشیان ناخەینە سەر بۆ جێبەجێکردنی کارەکەیان سەبارەت بەم ڕێگایەی کە ئارەزوومانە، چونکە لەوانەیە ڕێگای تایبەت بە خۆیان هەبێت لە جێبەجێکردنی کارەکاندا، هەروەك دەبێت کە گوێگرتن لە بیروڕا، ئارەزوو، گرنگیدانەکانیان فەرامۆش نەکەین بەر لە هەر بڕیاردانێك، قبوڵی بەرپرسیاریەتیش بکەین لە کاتی ڕوودانی هەڵەیەك لە جێبەجێکردن، یان بڕیاردان، دەبێت دانەبڕێین لە وتەو پەیڤی پیاهەڵدانو هاندان، گرنگتر لەمەش هەمووی ئەوەیە کە بێ بەڵێن نەبین بەرامبەریان، بۆ نموونە: نەبردنیان بۆ بازاڕ، یان پارکێك لە کاتی کە کارەکەیان بە تەواویو بە پێی پێویست تەواوکرد.

# باشترین نوێنەرانی فرۆش.. کێن؟

و: ئەسکەندەر ڕەحیم

سالآنە کۆمپانیاکان پارەیەکی زۆروزەوەند، بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ئەندامانی دەستەی فرۆش، بە خەرج دەدەن، بەڵام هەردەم بەرهەمەکەی جێی ڕەزامەندی نییە. هەر لەبەرئەوە، بڕێك توێژەر، هەستان بەسەرنجدانی ٦٠٠ کەس لە نوێنەرانی فرۆش، لە کاتی کۆبوونەوەی دەستەی فرۆشدا. لەو تۆژینەوەیەدا بۆیان دەرکەوت، نوێنەری فرۆش هەشت چەشنی هەیە. تەنها سیانی یەکەمیان (واتە ٣٧٪ یان) دەتوانرێت بەنوێنەری فرۆشە بەکارەکان دابنرێن. هەرچی پێنج چەشنەکەی کۆتاییە (واتە ٦٣٪ یان)، لە بە ئەنجامگەیاندندا سستو لاوازن.. بەڵام ئەوەی مایەی خۆشحاڵییە لەم کارەدا، ئەوەیە کە.. ئەم هەشت چەشنە، سروشتێکی ڕەفتاری دەنوێنێتو چەند تایبەتمەندییەکی چەقبەستوو نین، کە گۆڕانکاری پەسەند نەکەن. لێرەوە ئەگەر بەڕێوەبەری فرۆش، بەباشی لەم هەشت چەشنە گەیشت، ئەوا دەتوانێت فرۆشیاری شیاو، بەپێی لێهاتوویی‌و حەزەکانی، لە شوێنی شیاو دابنێتو تواناکانی هەر نوێنەرێکی فرۆش بەکار بهێنێتو بەگەڕی بخات. هەشت چەشنەکەش ئەمانەن:

١- شارەزا:

بەرهەمەکان بەئاسانی دەفرۆشێتو سەبارەت بە کۆمپانیاو خزمەتگوزارییەکانی، کاریگەرییەکی باش، لای کڕیاران جێ دەهێڵێت. هەروەها لەچاو هاوکارەکانی لە دەستەی فرۆشدا، بەزرترین تێکڕای فرۆش بەدی دەهێنێت. باشترین کار، بۆ ئەم چەشنەی نوێنەرانی فرۆش، ڕاهێنانی کارمەندە نوێیەکانی فرۆشە، تا ئەزموونو شارەزاییەکانی، بگوازێتەوە بۆیان، هەروەها لە هونەری فرۆشیشدا، ئامۆژگاری کارمەندە کەمتواناکانیش بکات. ئەم چەشنە ٩٪ی ئەو نوێنەرە فرۆشانەن کە، لە تۆژینەوەکەدا بەشدارییان کردبوو.

٢- پێکهێنەری گرێبەستەکانی فرۆش:

گرێبەستە گەورەکانی فرۆش ڕادەپەڕێنێت (هەڵبەتە لە فرۆشی بەرهەمەکاندا، نەك خزمەتگوزارییەکان)، لە وەڵامدانەوەی ڕەخنەی کڕیارانیشدا زۆر بەتوانایە، بەڵام شێوازە هێمنو نەرمونیانەکەی لە گفتوگۆکردنی لەگەڵ کڕیارەکاندا، ڕەنگە سەرنجی بڕێك ڕانەکێشێتو لەبارەی ئەوەی لێی دەدوێت، بەرەو بیرپەرتییان ببات. هەر لەبەرئەوە ئەم چەشنە پێویستی بە خولی ڕاهێنانە، تا لە فرۆشی خزمەتگوزاری‌و هانداندا، پەرە بە تواناکانی بدرێت. ئەم چەشنەش ١٣٪ی تۆژێنەوەکە، پێکدەهێنێت.

٣- ڕاوێژکار:

باش دەزانێت؛ چۆن گوێ لە کەسانی دیکە ڕابگرێت. لەچارەسەرکردنی گرفتەکانو دۆزینەوەی چەند چارەسەری جیاوازو گونجاندنیشیاندا بۆئەوەی پێداویستیی کڕیارەکان دابین بکات، خاوەنی سەلیقەیەکی زۆرە. بەڵام لە یەك گۆشەوە لە کاروبارەکان دەڕوانێت. هەر لەبەرئەوە ئەم چەشنە، لە هونەری فرۆشدا پێویستی بە خولی ڕاهێنان هەیە.. تا فێری چۆنێتیی ڕوانین لە گشت گۆشەکانی بابەتەکەوەو توندوتۆڵکردنی پەیوەندیی ڕاستەوخۆ، لە نێوان خۆی‌و کڕیارەکاندا ببێت. ئەم چەشنە کە ١٥٪ی تۆژینەوەکە دەنوێنێت.. خاوەنی ئەو توانایانەیە، کە ڕێگە خۆشدەکەن، ببێت بە یەکێك لە شارەزاکانی فرۆش.

٤- چیرۆکخوان:

لە بەرپاکردنی پەیوەندیی دۆستانە لەگەڵ کڕیاراندا پەلەیەتی، ئەویش بەوەی چەند وێنەو نموونەیەکیان، لە ئارادا هەیە، پێدەداتو ئەوەی دەیڵێت، دەیسەلمێنێتو بەڵگەش لەسەر ئەوە دەهێنێتەوە، کە ئەو بەرهەمو خزمەتگوزارییانەی کۆمپانیا پێشکەشیان دەکات، زۆر پێویستە بۆیان.. بەڵام ئەم چەشنەی نوێنەرانی فرۆش، جارجارە ناتوانن بەسەر ئەو چیرۆکانەی دەیگێڕنەوە، زاڵ ببن.. ئەویش بەوەی درێژەیان پێدەداتو بیری کڕیاران پەرتەوازە دەکاتو کاتیان وەك تۆزی بانان لێدەکات، بێئەوەی هیچ گرێبەستێك بەدی بهێنێت. ئەم چەشنە کە ٧٪ی تۆژینەوەکە پێکدەهێنێت، پێویستیان بە کەمکردنەوەی قسەو قوڵبوونەوەیە لە باسکردنی تایبەتمەندییەکانی بەرهەمەکە، یان خزمەتگوزارییەکەدا، هەڵبەت بێئەوەی زۆر درێژە بکێشێت.

### ٥. زۆر قاڵبوو:

ئـەو بەرهەمـەی دەیفرۆشـێت، باش دەیناسێتو زۆر بەتوندییش باوەڕی پێیەتی، بـەڵام متمانـی بەخۆی نییـە. ئەمەش لە پەیوەندیکردنـی لەگەڵ گـەورە کڕیاراندا، کاریگەری دەبێت. هەمیشـە لەسەر خستنە ڕووی تایبەتمەندیـیو ناوازەییەکانـی بەرهەمەکە، بە دووورودرێژی.. پێدادەگرێتو گوێ بۆ پێداویسـتییەکانی کڕیار ڕاناگرێت. ئـەم چەشـنەش ١٩٪ی تۆژینەوەکـە پێکدەهێنێت.

### ٦. خوێنەری سیناریۆ:

تایبەتمەندییەکانـی ئـەو بەرهەمەی دەیفرۆشـێت، هەروەها پێداویسـتییەکانی بازاڕو کڕیاڕانی، باش دەزانێت.. بەڵام لەسەر ئـەوەی وشـە بە وشـەی دەقی فرۆشـەکە وەك خـۆی – بێ هیـچ گۆڕانکارییەك، یان لابردنێك، یان جێگۆڕکێیی هیچ دەستەواژەو ڕستەیەك بۆ خوێنەر بخوێنێتەوە. ئەمەش بەرەو شکسـتی دەبـات لـە وەڵامدانەوەدا، بەهـۆی ڕەخنە لە پرەکانی کڕیاران.. کە لە دەقی ئەو «سـیناریۆ»ی فرۆشـەی لەبەری دەکاتو لەگەڵ هەموو کڕیارێکدا دەیڵێتەوە، نەهاتووە.

ئەم چەشـنە لـە نوێنەرانـی فرۆش پێویستیان بە چەند خولێکی ڕاهێنان هەیە.. تا فێری چۆنێتی وەڵامدانەوەی سەرپێییانە ببێـت، بـۆ ئـەو پرسـیارو ڕەخنانـەی کڕیـاران هەیانە. هەروەهـا بۆئەوەی فێری پابەندنەبـوون بکرێـت بە پیـت بە پیتو وشـە بـە وشـەی دەقەکانی فرۆشـتنەوە. ئـەم چەشـنەش ١٥٪ی تۆژینەوەکـە بەکار دەهێنن..

### ٧. دوژمنکارانە:

ئـەم چەشـنەی نوێنەرانـی فـرۆش، گرێبەسـت بـە باسـێکی ماددی پوخـت دادەنێت، ناشـتوانێت ئەوە لـە کڕیارەکەی بشارێتەوە. ئیدی لە سەوداگەریو دانوساندا قاڵ دەبێتـەوەو پێدادەگرێت، تا چۆن پێی خۆشەو بەو نرخەی بەدڵیەتی، دەیفرۆشێت. جاروبار ئـەوە دەبێت بە مایەی پێکهێنانی گرێبەسـتی گەورە، بەڵام زۆرجار کڕیاران، لـەو شـێوازە دوژمنکارانـە زاڵخوازییـەی پەستو بێزارن. هەر لەبەر ئەوە ئەم چەشنە پێویسـتیان بە ڕاهێنانە، بۆ دەسـتکەوتنی چەندان سەلیقەی جۆراو جۆرو ئاشنابوونی زۆرتر بە پێداویسـتییەکانی بازاڕو کڕیار. هەروەها پێویستی بەچەندان خولی ڕاهێنانە لە بـواری گەشـەپێدانی خودو سـەلیقەی پەیوەنـدیو چالاکـی کەسـێتی هەیە. ئەم چەشنەش ٧٪ی تۆژینەوەکە دەنوێنێت.

### ٨- کۆمەڵایەتی:

لە بەجێهێشـتنی کاریگەرییەکی باش، سەبارەت بە کەسێتیی خۆی، دەسپێشخەری دەکات. ئـەوەش لـە ڕێگـەی ئـەو وتوێژە دۆستانانەوەیە، کە تێیدا سەبارەت بەبابەتە تایبەتییـە دڵخۆشـکەرەکانی خۆی دەدوێت (وەك قسەکردن سـەبارەت بە منداڵەکانیو ئۆتۆمبێلەکەی)، بەڵام زۆرجار لە گەڕانەوە بۆسـەر کرۆکی بابەتەکە شکست دەهێنێتو لـە بەئاکامگەیاندنـی زۆر گرێبەستیشـدا سەرکەوتوو نابێت.

ئـەم چەشـنە پێویسـتی بـە چەندان خولـی ڕاهێنانە، تا لـە ڕێگەیانەوە.. فێری خێراگواسـتنەوە بێـت، لـە باسوخواسـی کۆمەڵایەتییەوە بۆ قسەکردن سەبارەت بەو خسـتنەڕووەی لەگەڵ کڕیاردا لێی دەدوێت. ئـەم چەشـنە ١٥٪ی تۆژینەوەکە دەنوێنێو پێیشی باشترە، لە نزیکەوە بەڕێوەبەرەکەی چاودێری بکات، بۆئەوەی خێراو ڕاستەخۆ ڕێنوێنی بکات.

المختار الإداري: ١١١

ئا: محەممەد مێرگەیی



# جۆن لۆجی بێرد... شکستی نەدەناسی!

ئامێرێك لە ماڵی هەمووماندا هەیەو لە زۆربەی کاتژمێرەکانی ڕۆژدا بەکاریدەهێنین، بەڵام زۆربەمان ناوو ژیانی داهێنەرەکەی نازانین. (جۆن بیرۆ) داهێنەری تەلەفزیۆنەو لە ساڵی ١٨٨٨ لەخێزانێکی هەژار لە شارێکی بچووکی شارەکانی وڵاتی ئەسکتەلەندا لە دایکبووە. باوکی نەیدەتوانی کاروباری بژێوی خێزانە بچکۆلەکەیان دابین بکات، بۆیە (جۆن بیرۆ)ی کوڕی بیری لە ڕێگەیەك کردەوە بۆ یارمەتیدانی باوکی.

لەو کاتەی (جۆن) تەمەنی گەیشتبووە سێزدە ساڵان، ڕۆژێکیان باوکی زۆر بەلایەوە سەیربوو کە لە شەقامدا دیتی (جۆن) لەگەڵ پیاوێك مامەڵەی شتفرۆشتن دەکات، باوکی بەسەرسوڕمانەوە لێی پرسی: (جۆن) ئەوە چی دەفرۆشیت؟ خەریکی چیت؟!

پیاوەکە سێ جونەیهی تەواوی دایە (جۆن)و پێیگوت: سوپاس ئەم پاترییە زۆر بە کەڵکم دێت.

دەبوا (جۆن)ی بچکۆلە ئەوە بۆ باوکی ڕوون بکاتەوە کە ئەو ئامێرێك بۆ یەکەمجار دروستدەکات. بۆ یەکەمجاریش شتێك دەفرۆشێت کە لەداهێنانی خۆیەتی. ئیتر هەر لەو ڕۆژەوە باروگوزەرانی خێزانەکەیان گۆڕاو هەرجارێك (جۆن) دەگەڕایەوە ماڵەوە هەندێك پارەو ئامێری کۆنی دەهێنایەوە کە بە پاشەکەوتەکەی دەیکڕی، بۆئەوەی بتوانێت ئامێری دیکەی نوێی لێوە دروست بکات.

سەرەڕای ئەوەی کە ماڵەکەیان بە زۆرێك لەو شمەکە کۆنانە قەرەباڵغ ببوو، بەڵام دایکی دڵخۆشبوو کە دەیبینی کوڕەکەی هەندێك لەو کەلوپەلانە بەکاردەهێنێتەوە بۆ دروستکردنی ئامێری نوێی بەسوودتر بۆ خەڵك.

(جۆن بیرۆ) گەورەبوو، چووە کۆلیژی ئەندازیاریو بەشی کارەبای تەواوکرد. هەرچەند ڕۆژگار تێپەڕدەبوو، ژوورەکەی ئەویش پڕدەبوو لە کەرەستەی کۆن. (جۆن بیرۆ) ناوی ڕادیۆی بیستبوو کە زانای ئیتاڵی (مارکۆنی) دایهێنابوو. ئێزگەش لە زۆر ماڵدا هەبوو. ئەویش بڕیاریدا ڕکابەری (مارکۆنی) بکاتو ئامێرێکی نوێی وەها دابهێنێت کە هەر بەتەنها دەنگ نەبێت، بەڵکو وێنەش پیشانی خەڵك بدات. واتە ئامێرێك بێت وێنەو دەنگ پێکەوە بگوازێتەوە!

(جۆن)ی گەنج لە ماڵەکەیدا مایەوەو بەردەوام خەریکی تاقیکردنەوەی ئامێرەکانی بوو کە تادەهات پێشکەوتووتر دەبوون. دوای ئەوەی (جۆن) زانی کە تیشکی ژێرووەنەوشەیی خۆر دەتوانێت وێنە بگوازێتەوە بۆ نێوانێکی دوور، دەستیکرد بە کۆکردنەوەی شمەکە کۆنەکانی ودارشتنەوەیان بۆ دروستکردنی ئامێرێکی پەخشی دەنگو وێنە لەیەك کاتدا.

لەم کارەیدا جارێك شکستی هێنا، جارێکی دیکەو دەیان جار شکستی هێنا، ئەمە لە ساڵی ١٩٢٢دا بوو، (جۆن) خۆی بەدەست شکستەوە نەدا. لە تاقیکردنەوەکانیدا سەرەتا توانی وێنەی جێگیر بەدەست بهێنێت، دەنگی ڕادیۆش لە پشتەوەیدا پەخش بکات، لەم کاتەدا لەخۆشیاندا بەگاڵتەوە بەوێنەکەی دەگوت: وێنەی هاوڕێم دڵنیابە لە پاش چەند ڕۆژێکی تر دەجوڵێیتەوە، ئیتر نهێنی جوڵەی وێنەشی دۆزییەوە.

(جۆن بیرۆ) لە کارەکانی بۆ داهێنانی ئەم ئامێرە هەرگیز تووشی بێ ئومێدی نەبوو، هەوڵەکانی بۆ بەرەوپێشبردنی ئامێرەکەی بەجێگەیاندو ناوی لێنا (تەلەفزیۆن).

سەرەڕای کاریگەریی خراپی تیشکە زیانبەخشەکان بۆ سەر جەستەی (جۆن بیرۆ)و تووشکردنی بە نەخۆشی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز تووشی بێهیوایی‌و شکست نەبوو. ئەو بەهۆی ئەم داهێنانە مەزنەوە سوودی زۆری بە ملیۆنەها خەڵك گەیاند لەسەرتاسەری جیهاندا.

سەرچاوە: گۆڤاری العربی الصغیر/ ژمارە ١٥١



چیا عەبدوڵا

# گرنگی باوەڕ

لێکۆڵەری میسری (عبداللطیف محمد خلیفة) لە لێکۆڵینەوەیەکی دەروونیدا سەبارەت بە بەهاکان دەڵێت: لاو بەشێوەیەکی ڕەها پێویستی بە باوەڕە، لە ڕووی ئاینیو فەلسەفیو ڕەوشتییەوە، چونکە باوەڕهێنان ئەم شتانەیان پێشکەش دەکات:

- مانایەکیان دەداتێ بۆ ژیانو پاڵنەرە بۆیان کە هەڵوێستێکی ئیجابی بگرنو خۆشی لێ ببیننو کاربکەن لە پێناویدا.

- کۆمەڵە بەهاو پێوانەیەکە کە پەیوەندی بە خودی خۆیو دەوروبەرییەوە ڕێکدەخات.

- ڕاڤەیەکە بۆ واقیعو پەیوەندی ئەم بە بونەوەرەوەو بەو شتانەی کە ئەم لێی بەرپرسیارە.

بەڵام:

ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە دەبێت بڕوادار بیت بۆئەوەی ببیتە کەسێکی بەشدار؟

ئایا ئەمە چ باوەڕێکە کە دەبێت من بیهێنم؟

ئایا لە چ گروپو کۆمەڵێکدا بم بۆ ئەوەی باوەڕێکی ڕاستو دروست بهێنم؟

ئایا بوونی من چ مانایەکی دەبێت گەر باوەڕ نەهێنم؟

تۆ هەرکەسێك بیت، لەهەر گروپو کۆمەڵگەیەکدا بیت، هێزێکی ڕوحی هەیە کە لە ناخی تۆدایەو دەبێت ئاوی بدەیت، بۆئەوەی هاندەرت بێت بەرەو کاری گەورە، چونکە هێزی باوەڕی ناختە کە هاوکاریت دەکات ئامانجەکانی ژیانت دیاری بکەیت، پاڵنەرتە بۆئەوەی کە بەردەوام بیت لە هەڵبژاردنەکانتو هەستی بەختەوەریت پێدەدات، چالاکییەکت دەداتێ کە بڕانەوەی نییە.

هەردوو لێکۆڵەری دەروونی ( د. لیس باروت ود - د. نیل کراك دارن) لە کتێبی (خۆشویستنی ئەو ژیانەی کە تێیدا دەژیت) چەند نهێنییەکی گرنگیان تیادا ڕوون کردووەتەوە، کە وادەکات ژیانت مانایەکی ڕۆحی هەبێت، ئەوان دەڵێن: (بۆئەوەی ژیانێکی تەندروست بژیت، بنەمایەکی گرنگ هەیە، ئەم بنەمایە زۆر سانایە، چونکە تەرکیز دەخاتە سەر هەموو کردارە بە بەهاکانو ئامانجداریشە، ئەویش باوەڕە.

باوەڕ ئەو پەیوەندییە بێ خەوشەیە کە لەگەڵ خوادا بەستوتە، پەیوەندییەکی ڕۆحی بەرزو باڵا لەگەڵ خوادا کە ڕۆحت پڕ دەکات لە باوەڕ، باوەڕیش ئەوەیە کە مرۆڤێکی گەورەو کاریگەر دروست دەکات).

هەروەها ئەو دوو لێکۆڵەرەوە دەڵێن: (لەو کاتەوەی کە دەستدەکەیت بە تێرکردنو دەوڵەمەندکردنی ڕۆحت، ئەوا تۆ لەسەر ئەو ڕێیەی کە ژیانێکی تەندروست بژیت، لایەنی دەروونیو کۆمەڵایەتیت تەندروست بێت، ئەمەش بەهۆی ئەم پەیوەندییە ڕاستەوە دروست دەبێت کە بەستووتە لەگەڵ دروستکارەکەتدا، کاتێك دەرك بە بوونی خوا دەکەیت لە هەموو کاروبارەکانی ژیانتدا، ئەوە بە دڵنیاییەوە ژیانێك دەژی کە پڕیەتی لە بەختەوەری).

کەواتە خوێنەری بەڕێز: خۆپڕچەککردن بە باوەڕ لە بنەما گرنگەکانی سەلامەتی ڕۆحو فیکرو جەستەن پێکەوە، لە دوای ئەمەشەوە هەرشتێکی تر کە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە خێری تێدایە.

وەك چۆن پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت:

(عجبا لأمر المؤمن، إن أمره كله له خير، وليس ذالك لاحد إلا للمؤمنو إن اصابته سراء شكر، فكان خيرا له، وإن اصابته ضراء صبر فكان خير له).

واتە: حاڵو باری باوەڕدار زۆر سەیرو سەرسوڕهێنەرە، هەمووی بە خێر دەگەڕێ بەسەریدا، ئەمەش تەنها بۆ باوەڕدار وایە، ئەگەر تووشی خۆشیو خێرێك بوو، سوپاسی خوای لەسەر دەکاتو دەبێتە خێر بۆی، ئەگەر توشی بەڵاو نەهامەتییەك بوو ئارامدەگرێ لەسەری، دەبێتە خێر بۆی.

بەشی چوارەم

و: بۆ کوردی: پشتیوان موبارەك

# حەوت ڕەفتار کە زۆرترین کاریگەرییان لەسەر خەڵك هەیە




پوختەکردنو وەرگێڕانی بۆ عەرەبی:-د.احمد الشازلی

**سەرکەوتن بۆ هەمووان**

لەم ژمارەیەدا باس لە ڕەفتارێکی دیکە دەکەین کە تایبەتە بە هەڵسوکەوت لەگەڵ کۆمەڵگادا...

**ڕەفتاری چوارەم: سەرکەوتن بۆ هەمووان:**

کارلێکی مرۆڤایەتی لە ژیاندا گەلێك پەیوەندی هەیە، بەڵام باشترین پەیوەندییان کامەیە؟ چۆن خۆمان لەسەر ئەو پەیوەندییەی کە هەمووان لێی سودمەند دەبن پەروەردە بکەین؟

پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان شەش جۆری هەیە:

١- سەرکەوتن، سەرکەوتن: سەرکەوتنی هاوبەش.

٢- سەرکەوتن، دۆڕان : کێبرکێ ( من دەیبەمەوە، تۆ دەیدۆڕێنیت.

٣- شکست، سەرکەوتن: کەسێك داوای هێزی پشت پێبەستراو دەکات بە ڕەزامەندی ئەوانی تر.

٤- شکست، شکست: کەسێك کارێك دەکات کە ئەوانی تریش زەرەرمەندبن، تەنانەت ئەگەر لەسەر حسابی خۆشی بێت.

٥- سەرکەوتن: تەواوی هەوڵەکانی لەسەر ئەو کارانە چڕ دەکاتەوە کە پێویستییەتی، ئیتر گوێ نادات بە پێویستیو داواکاری ئەوانی تر.

٦- سەرکەوتن، سەرکەوتن، یان ڕێکەوتن نییە: ئەگەر نەگەیشتینە پەیوەندییەکی هاوبەشی سەرکەوتوو، ئەوا ئێمە ڕازین لەسەرئەوەی کە ڕێکنەکەوین.

* ژیان قورسو پڕ کێبرکێ دەبێت ئەگەر بە لۆژیکی ((ئەگەر خەڵکی تر براوەو سەرکەوتوو بوون، ئەوا من دەیدۆڕێنم))، لێی بڕوانین.

* باشترینی ئەو پەیوەندییانەش بە شێوەیەکی ڕەها بریتییە لە (سەرکەوتن، سەرکەوتن...)

((سەرکەوتن بۆ هەمووان)) لە کاتێکدایە کە تایبەتە بە دۆزینەوەی چارەسەری بە سودو جێگەی ڕەزامەندی بۆ هەردوولا لە کاتی گفتووگۆو پەیوەندییەکاندا "نەك بۆ یەکێك لەسەر حسابی یەکێکی تر".

* ئەم ڕەفتارە زۆر شتت بۆ دروستدەکات، لە کاتێکدا وات لێدەکات بە ئاسانی بگەیت بە ڕێکەوتن لە نێوان هەردوولادا، ئەم ڕەفتارە پێت دەڵێت: هەمیشە هەڵبژاردنی سێیەمیش هەیە نەك دوو هەڵبژاردن (بردنەوە، یان دۆڕان) ... بەڵکو هەمیشە هەڵبژاردنی سێیەمیش هەیە، هەوڵدەدات پەیوەندییەکە چاك بکاتو هەردوولا پێکەوە بیبەنەوە، بەدوایدا بگەڕێ.

# ئەم پەیوەندییە پێنج ڕەهەندی هەیە:

*کەسێتی:- (کە بەردی بناغەیە):

* دروستی ئەو بەهایەی کە ژیانمان لەسەر بنەماکەی دادەنێین.

* پێگەیشتن: هاوسەنگی نێوان ئازایەتیو دەستکەوت.

* کرانەوەی ژیریو ئامادەگی بیروهۆش.

* پەیوەندییەکان: ڕووپامایی و ڕێزگرتنو سەرسوڕمان، تێڕوانینی لایەنی بەرامبەر.

* ڕێکەوتن: کە سیستەمی هەڵسوکەوتو پەیوەندییەکان دەگۆڕێت لە سیستەمی ستوونییەوە (سەرۆکو ژێردەستە) بۆ سیستەمی ئاسۆیی (هاوبەشو گروپەکەی)، زۆر بواری هاوکاری دەگرێتەوە، وەك:

* ئامانجە داواکراوەکان: چی بکەینو کەی؟!!

* ڕێبەری (ڕێنمایی): ئەو نەگۆڕانەی کە لەسەر بنەمایان کارەکە دەکرێت..

* سەرچاوەکان: مرۆییو تەکنەلۆجیو هونەریو ڕێکخراوەیی.

* بەرپرسیارێتی (سیستەمی لێپرسینەوە):- پێوەری شێوازی جێبەجێکردنو هەڵسەنگاندن.

* ئەنجامەکان: لە ئەنجامی هەڵسەنگاندنەکەوە چی ڕوودەدات..

پێویستە فەرمانبەر لەم سیستەمە تێبگات، لە کاتێکدا فەرمانبەر خۆی بەرپێوە دەبات لەو چوارچێوەیەی کە پێشتر دانراوە، پاشان ڕۆڵی بەرپێوەبەر دێت، لە دەستپێکردن بە کارو لابردنی نارەحەتییەکان لەبەردەم فەرمانبەران..

* سیستەمی پاڵپشتیکردن: پێویستە پاداشتەکان لەگەڵ چالاکییەکاندا گونجاو بێت.

* چالاکی: چۆنییەتی بەجێهێنانی ((سەرکەوتن بۆ هەمووان))

* تێڕوانینی کێشەکە لە تێڕوانینی ئەوانی ترەوە...

* ناسینی خاڵی بنەڕەتو هەرچییەکیش پەیوەندی پێوە دەبێت.

* باشترین چارەسەر چییە کە باشترین ئەنجامی پەسەندکراوت پێدەدات...

* زانینی هەڵبژاردنو ڕێگا چارەکانی تر بۆ دەستکەوتنی ئەم ئەنجامانە.

* پێویستە بزانیت کە ئەم سیستەمە سیستەمێکی تایبەت نییە، بەڵام بە بێ هاوکاریکردن لەگەڵ خەڵکدا ناتوانیت بیگەیەنیتە ئەنجام.




# مرۆڤ: ڕێخۆشکردن

ن: د.حسان شمسی پاشا
و: یەحیا محەممەد عەلی

هیچ مرۆڤێکی ژێـر لاری نییە، لەوەی کە تەندروسـتی لە بەهرە هەرە گەورەکانی خوای باڵادەسـتە، تەندروستی وەك ئەمڕۆ دەیناسـێنین، ئەو بارەیە کە کەسێك نوقمی لەشساغیو تەندروسـتی ڕۆحیو دەروونیو کۆمەڵایەتی بووە..

هەموو پزیشـکان لە ڕابردوو ئێسـتادا، کۆکن لەسـەرئەوەی کاری پزیشـکەکان دوو جۆرە:

١- پاراسـتنی تەندروسـتی لـەلای لەشساغەکان.

٢- گێڕانـەوەی تەندروسـتی بـۆ نەخۆشـەکان، لـە ڕێگـەی دەرمـانو چارەسەرکردنەوە..

ئاینـی پیرۆزی ئیسـلام، هانمان دەدات بۆ خۆچارەسـەرکردنو پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێـت) دەفەرموێـت: (خودا هیچ دەردێکی نەناردووە، بەبێ دەرمان.).

ڕێکخـراوی تەندروسـتی جیهانـی پێناسـەی تەندروسـتی بـەم شـێوەیە دەکات: (تەندروسـتی: واتە لەشسـاغییەکی تـەواو، لـە ڕووی جەسـتەییو دەروونییو کۆمەڵایەتییـەوە، نـەك تەنها نەهێشـتنی بێتواناییو نەخۆشی).

**یەکەم: تەندروستی:**

تەندروستی سێ جۆرە:

**١- تەندروسـتی جەسـتەیی:** ئـەو تەندروسـتییەیە کە پەیوەسـتە بە جەستەی مرۆڤەوە، بۆ بەدەسـتهێنانی پێویسـتە خۆمان بـە دووربگرین لـەو خۆراکانەی کـە زیان بە جەسـتەمان دەگەیەنن، هـەروەك چۆن مانای دوورکەوتنـەوە دەگەیەنێت لەو نەریتو خووە خراپانەی کە دەبنە هۆی لاوازیو نەخۆشی... کە لە داهاتوودا بە وردی باسیان لێوە دەکەین.

**٢- تەندروستی مێشك:**

بریتییـە لـەو تەندروسـتییەی کـە پەیوەسـتە بـە بیروهۆشـی مرۆڤـەوە، پێویسـتە پارێزگاری لە مێشـك بکرێت، بە دوورکەوتنـەوە لە هەموو ئـەو هۆکارانەی کە مێشـك بـەرەو لاوازیو پەرشو بڵاویو بێهۆشـی دەبەن، وەك خواردنـەوەی ماددە کحولییـەکانو مـاددە هۆشـبەرەکان.. نەبەخشـینی بیرۆکەی خراپو نەرێنی بە مێشك..

تەندروسـتی بیروهـۆشو زەینێکـی ڕوون، شـتێك نییە وەربیگریـتو لە خۆڕا دەسـتت بکەوێت، بەڵکو شـتێکە خۆت پێی هەڵدەستیت، جا بۆ گەیشتن بە بیروهۆشێکی تەندروست، ئەوا پێویستە گرنگی بە خودی خۆت بدەیت، واتە:

- هەست بە گرنگیت بکەیتو ئاگاداری خـۆت بیـت، خـۆت خۆشـبویو ڕقـت لە کەسـایەتیت نەبێت، گرنگی بە تەندروستی جەستەییت بدەیت.

- باش بخۆیتو باش بخەویت، پارێزگاری لە وزەو توانات بکەیت، چێژوەرگریت لەوەی خودا ڕێگەی پێداویت.

- واخۆت ببینی کە کەسێکی بەهاداری، نەك کۆپی کەسێکی دی، بەڵکو خۆت بنیات بنێ بە پشتبەستن بە خودا، پاشان بە کارو پلانێکی بەهێزو بەردەوام.

- دادوەربە، بەسـەر کەسایەتیتەوە، بە پێوانەی مامناوەند، ئامانجو پلانێك بۆخۆت دامەنـێ، کە ئەنجامدانی مەحاڵ بێت، وەك پێویسـتە لە هەموو شتێکدا جیاواز بم، لە خەڵکیو هەمیشە لە یەکەمەکان بم... پاشان سەرکۆنەی خۆت بکەی کاتێك ئەم ئامانجە نەهاتە دی.

**٣- تەندروستی دەروونی:**

تەندروستی دەروونی پەیوەستە بە لایەنی ڕۆحییەوە، لـە ڕێگەی باوەڕبوون بە خوداو بەجێهێنانـی پەرستشـەکان، خۆڕازاندنەوە بە ڕەوشـتە جوانـەکانو ئاکارە بـەرزەکان، مرۆڤی باوەڕداری ڕاستەقینە نازانێت ڕێگەی نەخۆشییە دەروونییەکان لە کوێیە. چونکە لە نەخۆشیو هەژاریو دەردەسەری گرفتەکان ناترسێت، لەبەرئەوەی دەزانێت کە ڕۆژیدەر تەنهـا خـودای میهرەبانـە، بەڕێوەبردنـی کاروبارەکانی دنیا بە پێی نەخشەو پلانێکی تۆکمـەو بەهێزو بێ وێنەیـە، کە لە لایەن خودای باڵادەستەوە داڕێژراوە.

هیـچ کام لـە تەندروسـتی مێشـكو دەروونو جەسـتە بەدینایەت بەبێ یەکتر، وەك وتراوە: (بیروهۆشی کامڵو تەندروست لە جەستەی تەندروستدایە، پێچەوانەکەشی ڕاستە)!

کەواتـە پێویسـتە ئەرکـە دەروونـیو جەستەییەکان هەریەکەیان پشت بەوانی تر ببەستێت!

سەرچاوە: الثقافة الصحیة

# بڕوابەخۆبوون!



شۆخان محەممەد کەریم

بڕوا بەخۆبوون هۆکارێکی سەرەکییە بۆئەوەی مرۆڤەکان بەسەر زۆرێك لە کێشەو گرفتەکانیاندا سەرکەوتووبن، هەروەها هۆکارێکیشە بۆئەوەی ببن بە کەسانی داهێنەرو بە توانا، ئەمەش بەوەدەبێت کە مرۆڤەکان لە هەموو چالاکییەکی ڕۆژانەیاندا، متمانەیان بە خۆیان هەبێت، جا چالاکییەکان لە بواری کۆمەڵایەتیدا، یان خوێندن، یان ئابوری.. هتد، بێت.

سەرەتا متمانە بەخۆبوون، دەتوانم بڵێم لە خێزانەوە دەستپێدەکات، هەر لە ساڵەکانی سەرەتای تەمەنی منداڵییەوە، دایكو باوك دەتوانن بەشێوەیەك مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانیاندا بکەن، کە متمانەیان بەخۆیان هەبێتو لەسەرپێی خۆیان بووەستن، ئەمەش زیاتر بەوە دەبێت کە نەیانشکێننەوەو لەسەر چاکەکانیان ئافەرینیان بکەنو هەڵەکانیشیان بەشێوەیەکی دروست بۆ ڕاست بکەنەوە.

لە پاش خێزان قوتابخانە کاریگەری زۆری هەیە بۆئەوەی تۆوی متمانەو بڕوابەخۆبوون لە مرۆڤەکاندا بچێنێت، بۆئەوەی منداڵەکانمان کەسانێکی شەرمنو ترسنۆكو دوودڵو ڕاڕایان لێدەرنەچێتو ببن بە تاکی بەسوود بۆ خۆیانو کۆمەڵگەکەیان.

ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی زیاتر متمانەبەخۆبوون:

١- دیاریکردنی ئامانج لە ژیاندا: کاتێك مرۆڤ لە ژیاندا ئامانجێکی نەبێتو بەبێ ئامانج ژیان بەسەربەرێت، هەست بەداڕووخانو بێ متمانەیی دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی زۆر بەساناییو بەبێ نرخی کاتەکانی خۆی بە فیڕۆ بدات، هەر بۆیە پێویستە هەموو تاکێك ئامانجو بەرنامەی خۆی هەبێت بۆئەوەی بزانێت چی دەکاتو خەریکی چییەو کارەکانی ئەنجامی هەیە، یان نا؟

٢- بە خۆشیو شادییەوە پێشوازی لەو ڕۆژە نوێیە بکە، کە لێت هەڵدێتو خەم بۆ ڕابردوو مەخۆو زۆریش خۆت سەرقاڵی داهاتوویەکی دوور مەکە، کەواتە لە بیری ئەو کاتەدابە، کە تیایدا دەژیتو هەوڵبدە بەشێوەیەك بەڕێی بکەیت، پەشیمانی لەدوا نەبێت.

٣- گرنگیدان بەڕێکوپێکی شێوەو ڕووخسارو ڕەچاوکردنی پاکوخاوێنی جلوبەرگ، لەبەرئەوەی شێوەو ڕووخسارو پاکوخاوێنی، جێگەی تێڕامانو لێوردبوونەوەی دەوروبەرە.

٤- پتەوکردنی پەیوەندی بە خودای تاكو تەنهاو ملکەچبوون بە فەرمانەکانیو دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانیو پشتبەستن پێی لە هەموو کاروبارێکی ژیاندا.

## چۆن متمانە لە خۆماندا دروست بکەینو باوەڕمان بە خۆمان هەبێت؟

١- بوونی باوەڕێکی پتەو بە خوداو پەیامبەرەکەیو بە هەموو ئەو بەڵێنو هەواڵانەی کە بۆیان ناردووین، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی لە شکست نەترسینو زیاتر بڕوامان بەخۆمان هەبێت.

٢- زانستی بەردەوامو هەمەجۆر لە هەموو بوارێکدا، ئەمەش لە ڕێگەی خوێندنەوەی بەسوود، یان خوێندن، لەلای مامۆستایانی شارەزاو دڵسۆزو لێهاتوو، یا تێکەڵبوون لەگەڵ کەسانی سەرکەوتوو لە ئەزموونەکانی ژیانو وەرگرتنی زانیاری لێیانو دوورکەوتنەوە لە کەسانێك کە هەموو دانیشتنو کۆڕوکۆبوونەوەیەکیان تەنها باسی کۆکردنەوەی سەروەتو سامانو پارەو پوولە.

٣- بیرکردنەوەی بەردەوام لەسەرکەوتن: ئەم جۆرە بیرۆکانە مرۆڤ بەرەوسەرکەتن دەبات، بۆیە پێویستە بەردەوام بەرەو لوتکەی چیاکان بڕوانینو لە کاتی هەنگاوناندا سەیری ئەو وردە بەردانە نەکەین کە لە شوێن پێکانمانەوە دەکەونە خوارێ، هیچ شتێکیش لە ژیاندا مەحاڵ نییە، کاتێك وشەی ناتوانم بە خەیاڵتدا دێت، پێی بڵێ هەوڵدەدەم، هەروەها بەرامبەر وشەی نازانم، هاوار بکە، فێردەبم، هەوڵبدە وشەی ناتوانمو نازانم بە تەواوی لە فەرهەنگی ژیانتدا بسڕیتەوە.

٤- هەوڵبدە خاڵە لاوازو بەهێزەکانی ژیانت دیاری بکەیتو پاشان هەوڵبدە لاوازەکان بەهێزو بەهێزەکانیش بەهێزتر بکەیت..

٥- مێشكو هزرت بکەرەوەو بزانە لە کام لەو کارانەی کە دەیانکەیت زیاتر سەرکەوتوویت، پاشان هەوڵی بەردەوامی کارەکەت بدە، چونکە کەمێکی بەردەوام باشترە لە زۆرێکی کۆتایی هاتوو.

٦- ماف بە هەموو لایەنەکانی ژیانت بدەو بە وریایی مامەڵە لەگەڵ ژیاندا بکەو ڕۆحی خۆت ئاسوودە بکە، بە بەهێزکردنی لایەنی ڕۆحیو دەروونیو بەخشینی زەردەخەنە بە کەسانی دەوروبەرو یارمەتیدانی منداڵانی هەژارو بێباوکان، ئەگەر توانای یارمەتیدانیشت نەبوو، بە دەستێکی نەرمو پڕسۆزەوە دەستێکی باوکانە، یان برایانە بەسەریاندا بێنە.

٧- پەیوەندی خۆت لەگەڵ هاوڕێیانو دۆستانو دەوروبەر پتەو بکەو پشتیوان بە خودای گەورە کەسێکی سوودمەندو سەرکەوتوو دەبیت!

سەرچاوە: ثقة بالنفس/د.هاني سليمان

زاهیر زانا

# وەڵامی ئێمە!

ژیان قوتابخانەیەو کۆی کایەکانیشی بریتین لە تاقیکردنەوەو پرسیار، وەڵامەکانیش بەپێی تێگەیشتنو ئاستو تواناو دونیابینیو تێگەیشتنو تەمەنو بارودۆخی مرۆڤەکان جیاوازی لە خۆدەگرنو ڕاڤەو لێکدانەوەکان دەشێت هەندێجار لە یەکتر جودابنو ململانێو کێبڕکێ دروست بکەن، وەڵامەکانی ئێمە بە پێی ئەو پرۆگرامەیە کە پەیڕەوی دەکەینو بڕوامان پێیەتیو دەبێت لە ئەنجامی وەڵامدانەوەمان بۆ پرسیارەکانی ژیان بیسەلمێنین، خوێندکارێکی بە کۆششو لێهاتوو تێگەیشتوو سەرکەوتوینو بە جۆشو خرۆشو چالاکییەوە ئامادەین ئەرکەکانمان ڕاپەڕێنینو بەختەوەری بەدەست بێنین.

هەڵسوکەوتو ڕەفتاری ئێمە لە ژیانو لەو تەرزە فکرییەوە سەرچاوە دەگرێت لەبەر ئەنجامی پرسیارگەلێکی وەك ئێمە کێین؟ بۆچی دروستبووین؟ چۆن بژین؟ بۆ کوێ دەچین؟ ئەرکو فرمانمان چییە؟ وەڵامەکانمان دەرخەری فەلسەفەی ئێمەیە لە ژین بۆ ژینو پیشاندەری بەهاو پرنسیپەکانمانە کە وەك نەخشەی کاری تەمەنمانەو دەبێت هیواو هەوڵمان لە پێناویدابێو بە بوونی هەر دژیەکییەك لە نێوان کارەکانمانو لەو بەهاو بنەمایانەدا خەسارەتمەندو ڕەنج بە خەسار دەبینو وەك ئەوە وایە وەڵامی وانەیەك بۆ وانەیەکی تر بدەینەوە، یان هەر لە بنەچەدا وەڵامێکی نادروستو شێواوو نەشیاوو ناتەواومان دابێتەوە کە بێگومان هیچ نمرەیەك لە بەرامبەردا وەرناگرین!!

گرنگ نییە تەنها وەڵام بدەینەوە بەڵکو زۆر گرنگە وەڵامی دروستو بەجێو گونجاوو مەعقولو مەقبول بدەینەوەو هەر پێشهاتو ڕووداوێکیش وەك تاقیکردنەوەیەك ببینین، بزانین وەڵامەکانمان کەسایەتیو تایبەتمەندی ئێمە دیاریدەکات، زۆرجار بینیومانە کەسانێك توشی کارەساتێك دێن، یاخود شتێك لە دەستدەدەن، ئیتر وادەزانن تەواوی ژیانیان لە دەستداوە، مەردومانێکیش هەن کە بارودۆخی لەمان سەختتریشیان گوزەراندووەو تاقیکردنەوەی لەوە گەورەتریان ئەنجامداوە، بە کۆڵنەدانو گەشبینیو هیواوە وەڵامیان داوەتەوەو خۆڕاگربوونو گەیشتونەتە ئاوەدانیو بیابانی سەختیان تێپەڕاندووە، کەمنین ئەوانەی بە باشە وەڵامی خراپەیان داوەتەوەو لەگەڵ بەدکاراندا باش ڕەفتاربوون، مەحوی ئاسا کە دەڵێت: (کەسێك شێتانە بەردم تێبگرێ، من بەرقی تێدەگرم). بۆمان دەردەکەوێت مرۆڤە مەزنەکان خۆیان لە پەرچەکردار پاراستووەو کاردانەوەکانیشیان وەڵامێکی شایستە بەخۆیانبووەو گیروگرفتو کێشەو تەنگو چەڵەمەکانیش نەیانتوانیوە لە ڕێبازی خۆیان لایانبداتو ڕەوڕەوەی ڕەفتاریان بگۆڕێت لەبەرئەوەی بناغەی بەهێزی کەسایەتیان هەبووەو خاوەن بیروباوەڕو ڕەوشتێکی چەسپاوو دروستبوون.

هەر پرسیارێك وەڵامێکی هەیە، ژیانیش پێویستی بە خوێندکاری کۆششکارو کۆڵنەدەرەو خاڵی سەرکەوتنی ئێمە ئەوەیە دروست تێبگەین، تابتوانین دروست وەڵام بدەینەوە بۆئەوەی هەست بە جەوهەری ناخی خۆمان بکەین، خۆمان بدۆزینەوەو ئەو ڕێگایە هەڵبژێرین کە دەمانگەیەنێتە مەنزڵو مەبەست.

لە هەر کارێکدا کە ئەنجامی دەدەین دەبێت بزانین بۆچی دەیکەین؟ یا بۆچی نایکەین؟ بۆچی دەنوسین؟ بۆ دەخوێنینەوە؟ ئایا تەنها ڕۆژەکانی تەمەنمان بە ڕێمان دەکەن، یاخود سەرقاڵی نووسینەوەی دەفتەرە پڕ واتاکانی ژیانمانین، ئەگەر پێت بڵێن هەفتەیەکت تەمەن ماوە چی دەکەیت؟ گەر وەڵامی ئەم پرسیارە لامان نائاسایی بێت، ئەوا پێویستە کارێك بکەین ئەم وەڵامەمان لا ئاسایی بێت، لەبەرئەوەنا مەرگ دۆستبین، بەڵکو بە هۆی ڕازیبوونمان لە بەجێهێنانی ئەرکەکانمان تا ئەم ساتە بەڕێکوپێکیو تەواوی. ئەگەر وەڵامت هەیەو دەڵێی: فلانەکار دەکەمو ئێستا دەستت پێنەکردووە خەسارەتمەندیو پێویستە لەسەریشت ئێستا دەست پێبکەیت.

با پرسیارێکی تر لە خۆمان بکەین، گریمان خاوەنی تەمەنێکی زۆرینو لەگەڵ نەوەی نەوەکانمان ئەدوێین، ئەو شتانە چین کە بەشانازییەوە وەك دەسکەوتی ژیانمان بۆیان باسدەکەین؟ گەر ئێستا سەرقاڵی ئەوە نین بادەستپێبکەینو دەست بەکاربین بۆئەوەی جێ پەنجەی خۆمان جێ بهێڵین وەك وەڵامێك بۆ کەسێتیمانو لە ئێستاوە وەڵامەکانمان بۆ ژیان ئامادەبکەینو لە قوتابخانەی ژیاندا نەك هەرخوێندکار، بەڵکو ببینە مامۆستایەکی سەرکەوتوو....

بەڵێن ئەنوەر

# ئەو پردانەی نامان گەیەننە ئەوبەر!!

ئەو ڕەهەندە مەعریفییانەی لە سەرچاوەکانەوەبەدەستهاتوون،گوزارشتێکی واقیعین بۆ ژیارێکی ئەزمونگەرایی. هەموو ئەو بابەتە جەوهەرییانەی کە لە وێنای ئەندێشمەندانی حەقیقی ژیانەوە وەرگیراوون، تابلۆیەکی پڕ مانان بۆ ماهییەتی ژیان، تەنانەت ئەگەر بە سادەترین ئالەتی مەعریفی گوزارشت بۆکراو نەخشێنرابن، هەر گرنگی خۆیان هەیە. چونکە دروشمی ڕەهەندی بەیەکگەیشتن بۆ ئیتنیککردنی تاووتوێکردنی ڕاستییەکان لە بازنەی جیاوازی و ئەتەکێتی لۆژیکی گێتییانەدا ڕێچکە دەگرێت. کەواتە لێرەوە مەودای فەلسەفەو زانستەکان بەسەر پردی ئەم مامەڵانەدا دەپەڕنەوەو پاشان لە دایکدەبن. ئێمەی مرۆڤ هەریەکەمان خاوەنی ئایدۆلۆجیایەکی جیاوازین، ئەوەی کە ئەم جیاوازییانەی زیاترکردووە ئەو پانۆڕاما ماددی و مەعنەوییانەن کە هەموو ڕۆژێك ڕۆژێکی نوێیان بەسەردا دێت.

ئێمە ئەگەر خستنەڕووی کەموکوڕییەکان بە شتێکی خراپو عەیب بزانین، ئەوا شاردنەوەو پەردەپۆشکردنی کەموکوڕیوگەندەڵییەکان» ڕێگاخۆشکردنە بۆ دروستبوونی گەندەڵی تر. هەربۆیە ئەو ناڕاستانەی کە شوێنگەی خۆیان دەدۆڕێنن ئەوانەن کە ستراتیجییەتێکی شرۆڤەکارییان بۆ بنەمای مەسەلەکان پێ نییە، چونکە تەنها خەون بە لوتکە بەرزەکانەوە دەبینن‌و بە درێژایی تەمەنیان ئاواتی بۆ دەخوازن‌و گوێ بە جوزئییەت نادەن» بۆ نموونە ئەگەر جوزئێك لە مۆڕاڵ و میتۆدی بیرمەندێك لەو بچێت، ئەوا ڕاستەوخۆ دەبێتە لایەنگری ئەو کەسەو تەنها تامەزرۆی ئەو ڕوانگەیەی دەبێت کە تەنها خۆی دەیەوێت! کە لێرەدا وەکو بنەمایەك دەیبینێ‌و بنەمای خۆی بەبێ ڕەچاوکردنی هیچ کلتورو نەریتێکی ئەخلاقی دەگەیەنێتەوە بەو کەسە! لە کاتێکدا لەوانەیە کە بنەماو بنچینەی ئەو کەسە لەگەڵ بناغەو بنچینەی ئەمدا، بە ئەندازەی جیاوازی زەوی‌و ئاسمان بێت!!

مرۆڤ دەبێت خاڵی دەستپێکی بناغەکەی دەستنیشان بکات، بۆ دامەزراندن‌و میکانیزمی ئەم دەستپێکەش چەند هاوکاری لە کەسانی دیکە بخوازێت، هەر جێگای ئیعتیبارە، نەك ببێتە ئامرازێك‌و کەسانی تریش شۆفێری ئەو بن! مرۆڤی ئەم سەدەیە لە چەقبەستیدا نقوم بووە، یان لە مەودادا نغرۆ بووە. بەڵام چ مەودایەك؟ مەودای فیکری؟ مەودای مەعنەوی؟ مەودای ئایینی؟ مەودای داهێنان، یان شیعرییەت؟ نەخێر هیچکامێکیان، بەڵکو مەودای ماددی‌و ئەو ئایدۆلۆجییەتەی کە دروشمی ماتریالیزم هەڵیدەدات، بەداخەوە مرۆڤ لەم ململانێیەدا پەنگدەخواتەوەو کەمتەرخەمی دەکات لە پەیداکردنی زەوییەکی بە پیت، تاکو بناغەکەی لەسەر بینا بکات «هەمیشە سەرقاڵەو وەکو ئامرازێك وایە بەدەست کەسانی ترەوە، تەنها بینەری داهێنانەکانی ڕۆژئاوایەو بەوپەڕی دلگەرمییەوە پێشوازی لە مۆدێل و مۆڕاڵی ئەوان دەکات. ئێمە باسی بنەما دەکەین، باسی ئینتیمای لۆژیکی دەکەین، باسی هونەر دەکەین، باسی مەودای ڕامان دەکەین!

ئێمە زۆر پێویستمان بەوە هەیە کە بنەمای خۆمان بناسین، چونکە هەتا ماسکەکان لانەبەین‌و ڕاستی خۆمان دەرنەخەین، ئەوا هەرگیز دەوروبەری خۆمان ناناسین، ڕاستە کۆمیدیایەك تەعبیر لە ڕوو دەکاتو لە ڕوو دەدوێت، بەڵام ڕوویەك هەرگیز ڕاستی پشتی پەردەی نهێنی کۆمیدیا دەرناخات! ئێمە پێویستمان بە هاوسەنگی هەیە لە نێوان خودی خۆمان‌و ناخماندا، لەگەڵ دەوروبەرو جیهانی دەرەوەماندا، واتە نە

ئەوەندە بیرو فیکرمان لای شتانێکی بێ بنەماو بێناو بێت، نەئەوەندەش خولییای گەیشتن بە یەکجار بەرزایی بین، چونکە بەو ڕاددەو پێوەرەی کە بیر لە بەرژەوەندییەکانی خۆمان دەکەینەوە لە ئەندێشەو بیرکردنەوەی ئەوانی تر بێئاگا دەبین.

بەداخەوە دەڵێم: ئێمە ئەمڕۆ خولگەکانی ژیانمان وەستاندووەو بەلای خۆمانەوە وادەزانین کاریزمایەکین و لە گۆڕەپانی ململانێکاندا چارەسەری ڕادیکاڵی (ڕیشەیی)مان پێیە بۆ گرفتەکان، کەچی نەك کەیسەکانمان زیاتر کردووە، بگرە بووینەتە لەمپەرێك لەبەردەم گۆڕانەکاندا. ئەمڕۆ لە هەموو چەرخێك زیاتر پێویستمان بە شرۆڤەکردن و شیتەڵکردنی شارستانییەتە مەزنەکەی خۆمان و هاوشێوەی خۆمان هەیە، ئێمە ئەگەر هەتا ئەمڕۆ کاراکتەرێکی کاریگەر نەبووین لە گۆڕەپانی پێشکەوتن و داهێنانەکاندا، با لەمڕۆوە هاوکارو هەماهەنگی ڕۆشنبیران و داهێنەران و پێشکەوتنخوازان بین، با بەس بە دوای ڕوکەش و خواردن و ماددەوە بین کە ڕۆژ بە ڕۆژ ورگو سکمان بەرەو پێشەوە دەچێت، بەڵام عەقڵمان هەر لەشوێنی خۆیەتی و بگرە لە دواکەوتنیشدایە!! کە ئەمەش لە خۆیدا جێی داخەو کارەساتێکی گەورە دەخوڵقێنێت. چونکە بەڕاستی دڵسۆزی و داڕشتنی ستراتیژیەتی بەپرسیارێتی، هەمەلایەنەیە واتە لەم سەردەمەدا تاکێك بە تەنها ناتوانێت تەواوکەری ئەم میتۆدی بەرپرسیارێتییە بێت، چونکە کاریزمایی سەرکەوتوو «لە زنجیرەیەك ستراکچەری پەیوەست پێکهاتووە» واتە لە ئەنجامی هاوبەندێتی هاوکێشەی فرمانە پراکتیزەکراوەکانەوە هێزێکی پێشەنگ سەریهەڵداوەو پاشان توانیوێتی سەرلەبەری دیرۆکی شارستانییەتەکەی بنووسێتەوەو لە پێشەنگایەکی جیهانیدا بۆمان ڕوونبکاتەوە. با ئێمەش هەوڵبدەین بە دڵێکی پڕ لە خۆشەویستی و گیانێکی لە خۆبوردووانەوە درێژە بە ڕێگای دڵسۆزانی ئەم خاك و نیشتمانە بدەین، بەڕاستی ئەگەر ئەڵقەیەك لەو زنجیرە شایانەیە بپچڕێت بەهۆی کەمتەرخەمی لایەنێکمانەوە، ئەوا ئەو کاتە ئەمە دەبێتە هۆی زیادکردنی قورسایی سەرشانی لایەنە مەبەست پاکەکان، کە ئەو کاتە دەکرێت بڵێین کارەساتێکی ترسناك و گەورەمان خوڵقاندووە».



درەخشان بەهادین

# ئەو وانانەی لە "مێژوو"دا نەمانخوێند!

هەر لە قۆناغی سەرەتاییەوە وانەی مێژوومان خوێندووە، بەڵام ئەوەندەی لە بارەی جەنگیزو مەغۆلەکانەوە خوێندمان، هێند ە باسی باشی گەورەکانی مێژووی خۆمانمان بۆ نەکرا.

کەس پێی نەگوتین کە دەبێت سەرەتا ئاوێنەی مێژوومان پاك بکرێتەوە، تەپوتۆزی لە سەر لا ببرێت، بۆئەوەی ڕاستییەکان ببینین و بزانین. ئەزموونەکان لە بیر نەکەین و هەڵەکانیش دووبارە نەبنەوە.

دەربارەی جەنگەکان هەموو شتێك دەزانین، بەڵام لە بارەی ئاشتییەوە هیچمان نەخوێند.

کاتێك منداڵ بووین کەس ئێمەی فێر نەکردو پێی نەگوتین کە "کەیقوباد" کێ بووە؟ دەوڵەتی "ماد" کەی و چۆن دروستبووە؟ تا شانازی پێوە بکەین!

لە بەش و بابەتەکانی وانەی مێژوودا لە بارەی دابو نەریتی نەتەوەکان و جەژن و شادییە میللییەکان شتێك باس نەکراوە، بەڵام باسی جەنگی ۲۵۰۰ ساڵە بۆچی!

کە منداڵ بووین پێیان دەوتین ئەگەر لێیان دایت، تۆش لێبدە، دەیانویست فێرمان بکەن کە چۆن بەرگری بکەین، بەڵام کەس پێی نەوتین کە ئەگەر لێدرای، چۆن ببوورەو چاوپۆشی بکە، پێیان نەوتین کە دەتوانین لە بری لێدان و تۆڵە ببوورین و گەورەیی بکەین.

بەڵام ئێستاش نەچووە تا بچێت، بۆیە با لە ئێستا بەدواوە منداڵەکانمان فێربکەین کە چۆن بەخشندەبن و ببوورن، چۆن جۆرێکی تر لە دونیا بڕوانن، چۆن بەسۆزو میهرەبان و موحیبەت بن.

با پێیان بڵێین کە باشییەکانی دونیا سەد بەرامبەری جەنگ و خەمەکانە، کەواتە با دیدە بشۆین و جۆرێکی تر دونیا ببینین!




فەیلەسوفێكی ڕۆژئاوایی زۆرجوان باس لە هەڵسوكەوتو بیركردنەوەو ڕوانینەكانی تاكی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەكاتو دەڵێت: خەڵكی ڕۆژهەڵات زۆربەكەمی چێژ لە بۆنەو یادو خۆشییەكانی ژیانیان وەردەگرن، چونكە لە كاتی خۆشیدا خەفەت بۆ كۆتایی هاتنو تەواوبونی ئەو خۆشییە دەخۆن!

وتەی ئەم فەیلەسوفە منداڵیی خۆمی بیرهێنامەوە، بیرمە كاتێك نزیكی جەژن دەبوینەوە، پەڕەیەكمان دەهێناو چەند ڕۆژمان بمایە ئەوەندە خەتمان دادەناو هەر ڕۆژرژێك بڕۆشتایە خەتێكمان بەسەر خەتێكیاندا دەهێنا، واتە ڕۆژێك كەمبووەوە، بەمجۆرە بەتامەزرۆییەوە بەردەوام دەبووین، پۆشاكی نویو پێڵاوە نوێیەكانیشمان لەناو تاكەكەماندا بەرێكی دادەنا، هەتا ئەو شەوەی كە بۆ بەیانییەكەی جەژنە، ئەو شەوەش خەومان لێنەدەكەوتو خواخوامان بوو، زوو ڕۆژبێتەوە، بەهەرحاڵ ڕۆژیش دەبووەوەو لەگەڵ باوكم نوێژی جەژنمان دەكرد، دوای نوێژی جەژن دڵتەنگییەكی سەیر ڕووی تێدەكردم، خەفەتم دەخوارد لەوەی ئەو ڕۆژو ساتە خۆشەی كە چەند بەتامەزرۆییەوە چاوەڕوانی بووم، ئەوا هاتو بەداخەوە واخەریكە تەواو دەبێت!!

ئەوەی كە باسم كرد تەنها بۆئەوە بوو ئەوەتان پێ بڵێم كە ساتەكانی تەمەن دێنو دەڕۆنو ڕاناوەستن، لەسەرئەوەی كە تۆ چۆن تیایاندا دەژیت، زۆرجار گەشتێك دەكەیت، پاش گەڕانەوە بیرلە ساتەكانی دەكەیتەوە، هەست دەكەیت دەتوانیت باشتر تیایاندا بژیت، جوانتر پێشوازییان لێ بكەیت، بەچێژتر بەسەریانبەریت، پەشیماندەبیتەوەو دەڵێیت: بریا سەد بریا بەو جۆرەم نەكردایە، بەڵام خۆ لەو كاتەدا خۆزگەو بریاو ئەمشتانە سودیان نییە.

وابێنەپێشچاوی خۆت ئێستە تۆ پیربوویتو لە كۆتا ساتەكانی تەمەنتدایت، پەیامنێری یەكێك لە كەناڵەكان دێتەلاتو ئەم پرسیارەت لێدەكات: گەر بگەڕێیتەوە بۆ سەرەتاكانی تەمەنت، ئایا چۆن تەمەنت بەسەردەبەیت؟ تۆ چی وەڵام دەدەیتەوە؟

كەواتە وابزانە ئێستا ئەو پرسیارەت لێكراوەو تۆش هەوڵبدە ئەو تەمەنەی كە ماوتە لەگەڵ هاوڕێكانت، كەسوكارو دایكو باوكت، خوشكو براكانت، بەخۆشی بەسەریبەرە.

سوربە لەسەرئەوەی ببیتە سەرچاوەی خۆشی بۆ دەوروبەر.

بۆئەوەش بتوانین ساتەكانی تەمەنمان بەخۆشی بەسەربەرین، پێویستە ئەم چەند خاڵە ڕەچاو بكەین:

١- دەرك بە گەورەیی و گرنگی چركەساتەكانی تەمەن بكەین.

٢- ئەو ساتانە یادبكەینەوە كە بە ناخۆشی بەسەرمان بردوون، چیمان دەسكەوتووە جگە لە پەشیمانیو خەمو ناخۆشی، بە پێچەوانەشەوە ئەو ساتانەی كە بەخۆشی بەسەرمان بردوون چ دەرەنجامێكیان هەبووە؟

٣- زۆرجار ڕابردوی تاڵ ئێستاشمان بەخۆیەوە تاڵ دەكات، باشتر وایە تەنها بۆ ئەوەندە سود لە ڕابردوو وەربگرین كە هانمان بدات ئێستامان خۆش بكەین.

بەهیوای ژیانێكی خۆش بۆ هەموو لایەك.



# ژیان قوتابخانەیە..!

ئا: بەرزان ئەبوبەکر

**فێربە پێش ئەوەی دنیا فێرت بکات!**

**لە ئادابەکانی ژیان:**

گاڵتە بەکەسانی دەوروبەرتو خەونو هیواو ئاواتەکانیان مەکە.. بە تایبەت ئەو کەسانەی لە زانستو زانیاریو ماڵو ساماندا لە خوار تۆوەن، ڕەنگە دراوسێکەت، یان کەسانێك کە تۆ دەیان ناسیتو گاڵتەیان پێدەکەیت، پلەوپایەو ناویان لای خوای گەورە، لە زۆرێك لەو کەسانە بەرزتربن کە لای تۆ گەورەو شکۆمەندو بەهێزن.. لەبەرئەوە هیچ کام لە خەونە جوانەکانیانو هیواو ئاواتە بەرزەکانیان بە کەم مەزانە، دنیا بەبێ ئەو مرۆڤە سادەو پاکانە، گەشتێکی وشكو پڕبێزاریو بێکەڵکە، هەرچەندە لە واقیعیشدا جوان بێت.

**لە ئادابەکانی گفتوگۆ:**

زۆر بیربکەرەوە، ماوەیەکی زۆریش تەرخان بکە، بۆ فێربوون، پاشان کەم قسە بکە، ئەو کەسەی زۆر قسە دەکات، زۆریش هەڵە دەکات، نە ئەوەندە بێدەنگ بە خەڵکی وابزانن خوانەکردە لاڵو بێ زمانی، نە ئەوەندەش قسە بکە کە دەوروبەرت لە قسەکانت بێزار ببن.

مرۆڤ بۆئەوەی فێربێت، دەبێت سەرەتا گوێگرێکی باش بێت، هیچ کام لەو قسانەش فەرامۆش مەکە کە دەیبیستیت، چونکە بە دڵنیاییەوە لە ئایندەدا پێویستت پێی دەبێت!

**ئادابی لێبوردن:**

دوودڵ مەبە لە پێشکەشکردنی لێبوردن، بەرامبەر بەو کەسەی هەڵەت بەرامبەری کردووە، کاتێك داوای لێبوردنی لێدەکەیت، بڕوانە بۆ چاوەکانی، تا جگە لەوەی بە گوێیەکانی پەشیمانیت دەبیستێت، لە چاوەکانیشتدا پەشیمانیت بخوێنێتەوە! مرۆڤی ژیر لێبوردەیە، لەبەرئەوەنا کە لاوازو بێدەسەڵاتە، بەڵکو لەبەرئەوەی دڵی لە ڕقو کینە پاك بکاتەوە.

**ئادابی مامەڵەکردن:**

حوکم بەسەر هیچ کەسدا مەدە بە هۆی کەسوکارو نزیکەکانییەوە، خۆ مرۆڤ تەنانەت دایكو باوکیشی خۆی هەڵنەبژاردووە، چ جای کەسە نزیکەکانی. بەڵام هاوڕێ ئەو کەسەیە کە خۆت هەڵیدەبژێریت، بۆیە دەتوانرێت لە ڕێگەی هاوڕێکەتەوە هەڵسەنگاندنت بۆ بکرێت، وتراوە: مرۆڤ لەسەر ئاینی هاوڕێکەیەتی!

**ئادابی قسەکردن:**

کاتێك ناتەوێت وەڵامی پرسیارێك بدەیتەوە، بە زەردەخەنەوە بەو کەسە بڵێ کە پرسیارەکەی کردووە، تۆ لەو باوەڕەدایت، زانینی وەڵامی ئەو پرسیارە بۆ تۆ گرنگ بێت؟!

**ئادابی هەوڵدانو تێکۆشان لە ژیاندا:**

کاتێك لە گەشتێکی ژیانتدا شکست دەهێنیت، ئەزموون نادۆڕێنیت، چونکە لە هەموو شکستێکدا ئەزموونێك بەدەستدەهێنیت، کەواتە بە خێرایی هەڵسەرەوەو مژدەی سەرکەوتن بە خۆت بدەو دڵخۆشبە بە گەیشتنی یەکەم پلەی سەرکەوتن!

**ئادابی قسەکردن بە تەلەفۆن:**

کاتێك زەنگی مۆبایلەکەت لێدەدات، بە زەردخەنەوە وەڵام بدەرەوە، چونکە ئەو کەسەی قسەت لەگەڵ دەکات، لە ڕێگەی تۆنی دەنگتەوە زەردەخەنەکەت دەبینێت.

**لە ئادابی هاوڕێیەتی:**

هەڵە بچووکەکان کە لە نێوانتاندا ڕوودەدەن گەورەیان مەکە، ڕێگە مەدە ئەو شتە بچووکانە هاوڕێیەتیتان تێکبدات، چونکە هاوڕێیەتی ڕاستەقینە تاجێکە بەسەری مرۆڤەکانەوەیە!

هاوڕێیەتی بۆ بەرژەوەندی کاتییەو نامێنێت، بەڵام هاوڕێیەتی ڕاستەقینە خونچەیەکە، بۆنەکەی هیوایە، شیلەو گوڵاوەکەی وەفادارییە، شنەو شەماڵی خۆشەویستییە، وشکبوونی تەنها بە مەرگ دەبێت، هاوڕێیەتی شارێکە کلیلەکەی وەفادارییە، دانیشتوانەکەی وەفادارەکانن، هاوڕێیەتی درەختێکە تۆوەکەی وەفادارییە، لقو پۆپەکەی هیوایە، گەڵاکانی بەختەوەرییە.

ڕەمەزان عەبدوڵا

# چوونەوە یەك، یان فراوانی؟

هەر لە كاتی هاتنە دنیاوە ئەم بڕیارەمان داوە كە لە شوێنی تەسكو بچووك بێینە دەرەوە بۆ جیهانێكی گەورەو فراوان، ئەمە یاسای سروشتە بۆ گشت كەسێك بەبێ جیاوازی، بەڵام هەندێك كەس بەرگەی ئەم فراوان بوونە ناگرنو زوو لەناودەچن!

بۆیە ئەم دونیایە هەردەم لە فراوان بووندایە، بگرە هەردەم بۆ پیشەوە دەڕوات، بۆیە ئەو كەسەی لە كاروانی ژیان بەجێ بمێنێت ئەوا دەبێت لە شوێنە تەسكەكانی ژیان گوزەربكات!

گەر زیاتر ورد ببینەوە لە مرۆڤەكان سەفەرێكی ناوناخیان بكەین، ئەوا بۆمان دەردەكەوێت فراوانی لای مرۆڤ چۆنە!

لەم ڕووەوە مرۆڤەكان دەكرێن بەدوو بەشەوە: ئەوانەی هەمیشە لەگەڵ كرانەوەی ژیاندا فراوانبوونی خۆیان دەسەلمێنن، كۆمەڵەی دووەمیش ئەوانەن كەوا بەرگەی فراوانبوون ناگرن.

بۆیە هەمیشە دڵخۆشیو ئارامی بۆ ئەو كەسانەیە كەوا لەگەڵ ژیان خۆیان دەگونجێنن، نەك ژیان لەگەڵ خۆیان دەگونجێنن!

(دەگێڕنەوە ڕۆژێك قوتابی مامۆستایەكی بەساڵاچوو، داوای لە مامۆستاكەی كرد كە وانەیەكی فێر بكات.. بۆ ئەوەی تا لە ژیانداماوە لە بیری نەچێتەوەو وەك ئەڵقەی زێڕ لە گوێی بگرێت، مامۆستای پیر دوای هەندێك ڕامانو بیركردنەوە بە قوتابییەكەی گوت: برۆ كیسەیەكی گەورە خوێ بهێنە.

قوتابییەكە ڕۆیشتو پاش كاتژمێرێك كیسە خوێی هێناو گەڕایەوە، مامۆستای بە ئەزموون كیسە خوێیەكەی لێوەرگرتو یەك كەوچكی لێكردە نیوپیاڵە ئاوەوە، پاشان هەندێك شێواندیو بە قوتابییەكەی گوت: ئەو سوێراوە بخۆرەوە»

قوتابییەكە فەرمانەكەی بەجێهێناو دەستبەجێ قومێكی لە ئاوەكەدا، بەڵام هەر لەگەڵ تامكردنیدا خێرا پیاڵەكەی گێڕایە دواوەو گوتی: مامۆستا زۆر سوێرە.

مامۆستای پیر سەرێكی باداو قوتابییەكەی لەگەڵ خۆی برد بۆ كەنار دەریا، زۆر بە لێزانی هەموو خوێكەی ڕشتە نێو ئاوی دەریاكەوە، پاشان پیاڵەیەكی لە ئاوی دەریاكە پڕكردو بە قوتابییەكەی گوت: بیخۆرەوە»

قوتابی دیسان فەرمانی مامۆستاكەی بەجێهێنا، بەڵام ئەمجارە هەموو ئاوەكەی خواردەوە.

مامۆستا پرسی: چ تامێكی هەبوو؟؟

قوتابی:كەمێك سوێربوو، تەنهاپێویستی بە هەندێك ئارامگرتن هەبوو، مامۆستای دنیادیدەش سەری لەقاندەوەو گوتی:

# بەڵێن بە خۆت بدە!



و. لە فارسییەوە: وشیار عەلی

«ڕەنج و کێشەو گرفتی زۆر، کە مرۆڤ لە ژیاندا تووشی دەبێت، ڕاست وەك ئەو خوێیە وایە».

بۆیە ئەگەر دڵت بە ئەندازەی یەك پیاڵە بێت، ئەوا بە یەك کەوچك خوێ توانات لێدەبڕێت و ئەم دنیا فراوانەت لێدەبێتە بیرێکی تەنگو تەسك، بەڵام ئەگەر دڵت وێنەی دەریا بێت، لێبگەڕێ، یەك کیسە خوێ و بەڵکو دەیان کیسەش ناتوانێت سوێری خۆی، لە دڵی تۆدا جێ بکاتەوەو ئارامت لێهەڵبگرێت!

لەمەوە فێر دەبین ناخۆشییەکانی ژیان هەرگیز کار لەو کەسانە ناکات کەوا دڵەکانیان وەکو دەریا فراوانە، بەپێچەوانەی ئەم کردارەش هەر ڕاستە بچووکترین کێشە ناتوانێت بەرگەی بگرێت ئەو کەسەی دڵێکی بچوکی هەیە، زوو ئەتەقێ، یان زوو تێکدەچێت، بەرگەی ئەو کێشەیە ناگرێت و واهەست دەکات شاخێکە هەڵیگرتووە.

کەوایە ئەوانەی هەردەم لەگەڵ کاروانی ژیانان، ئەوانەن دڵەکانیان بۆتە بەهەشتێك بۆ گشت کەسێك!

خوای گەورە دڵ و دەروونمان سەلامەت بکات لە دەست تێکچوون و ژەنگاویبوون و بچووکبوونەوە لە گوناهو تاوانەکان، دڵفراوانی خەڵاتێکی خودایە، بۆیە گەر لە دەستت دا، ئەوا خۆت بەرپرسیاری، هەروەك ئەم پەندە جوانە دەڵێت: (پێویستە فێربین بەیەکەوە بژین، یا وەك نەفامەکان بەیەکەوە بمرین!).

گەر تا ئێستا لە کانیاوی بچووك بوونەوەدایت؟ گەر تا ئێستا ناتوانیت لەگەڵ کاروان بەرێبکەویت؟ ئەوا بڕیارت هەبێت پشت بەخوا ببەستە، یارمەتی دەدرێیت لەو ڕێگایەی پشتت پێبەستووە، یۆنانییەکان وتەیەکی جوانیان هەیە دەڵێن: (ئەوەی ویستی هەبێت، هێزیشی هەیە)، بۆیە دەست بکە بە ئامانج دانان و بڕیار بدە هێز پەیدا بکە، تا لەگەڵ کاروانی ژیان لەگەڵ دڵە گەورەو فراوانەکان بژی!

سوودوەربگرین لە کەسانی سەرکەوتووی پێش خۆمان، تا بتوانین داهاتوو بدۆزینەوە، لە کۆتاییدا تەنها ئەم وتەیە دەڵێم تا سود لە چرکە ساتەکانی تەمانمان ببینین و کەسەکان بناسین و بیانخوێنینەوە، پێش ئەوەی بڕیاریان لەسەر بدەین و ببنە قەبارەیەك لە دڵماندا (جیهان کتێبێکی جوانە، بەڵام بێسوودە، بۆ کەسێك کە نەتوانێت بیخوێنێتەوە!)

بەڵێن بە خۆت بدە: ئەوەندە بەهێز بیت کە هیچ شتێك نەتوانێت ئارامیت لێ تێکبدات.

بەڵێن بە خۆت بدە: لە هەر وتووێژێکدا وشەگەلێکی وەکو لەشساغی و شادمانی و بەختەوەری بەکاربهێنیت.

بەڵێن بە خۆت بدە: هەردەم بە بیری هاوڕێیانتی بێنیتەوە کە ئەوان چەندە بە توانان، هەستی باش و ئەرێنی و سوودمەندی لەواندا دروست بکەیت.

بەڵێن بە خۆت بدە: لە هەر شتێکدا نیوە ڕووناکەکەی ببینیت، تا ئەو کاتەی تاریکی سەری خۆی هەڵدەگرێ و خەونەکان بەرەو ڕاستی هەنگاو دەنێن.

بەڵێن بە خۆت بدە: بیر لە باشترین بکەیتەوە، بۆ باشترین هەوڵبدەیت و داوای باشترینیش بکەیت.

بەڵێن بە خۆت بدە: هۆگری سەرکەوتنی کەسانی دی بیت، بە جۆرێك کە وابزانی سەرکەوتنی خۆتە.

بەڵێن بە خۆت بدە: هەڵەکانی ڕابردووت تەنیا بۆ ئەزموون بە بیری خۆت بێنیتەوە، بەرەو بەدەستهێنانە گەورەکان لە داهاتوودا هەنگاو بنێیت.

بەڵێن بە خۆت بدە: بە خەندەوە تەماشای هەموو ڕسکاوە زیندووەکان بکەیت.

بەڵێن بە خۆت بدە: هێندە بۆ گەشەو گەورەبوونی خۆت کات تەرخان بکەیت، تا ئیدی کاتێکت بۆ سەرکۆنەکردنی خەڵکی نەبێت.

بەڵێن بە خۆت بدە: بەرامبەر سەختییەکان ئارامگر، بەرامبەر ترس بەهێز و لە بەرامبەری توڕەییدا خۆڕاگر بیت.

بەڵێن بە خۆت بدە: کە باشترین بیت و بە هەموو جیهانی ڕابگەیەنە کە باشترینیت.

تا کاتێك کە کردەوەکانتان باشترین بوونی ئێوە دەپارێزن، تەواوی گێتی بە چەشنێك لە دەستی خۆتاندایە.

سەرچاوە: مجلە شادکامی و موفقیت.



# ئایا کەسێکی کۆمەڵایەتیت؟

هیوا ئارام

حەز بە دانیشتن، یان قسەکردن لەگەڵ کەسانی دی دەکەیت؟

ئەگەر دوو کەس لە خێزانێکدا بن، یەکێکیان زۆر کۆمەڵایەتی بێت، حەز بە سەردانو هەواڵ پرسینو تێکەڵاویو هاوکاری کەسانی دی بکات، ئەوی دیکەیان بە پێچەوانەوە ڕقی لە تێکەڵاویو میوانو سەردان بێت، هەمیشە بیانووی سەرقاڵیو زۆری ئیشو کار بۆ بەرامبەرەکانی بێنێتەوە، تۆ حەز دەکەیت کامیان بیت؟ بە مانایەکی تر بڵێین تۆ کام لەم دوو کەسەیت؟ کەسێکی کۆمەڵایەتیت؟ یان گۆشەگیر؟

ئێستا لەگەڵمان بە، وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوەو پەنجە لەسەر ڕاستییەکان دابنێ:

١- ئایا بە قسەو گوفتارەکانت سەرنجی هاوڕێو دۆستە نزیکەکانت بۆ لای خۆت ڕادەکێشیت؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر. ج- هەندێجار.

٢- ئایا هاوڕێو کەسە نزیکەکانت سەبارەت بە کاروبارەکانیان ڕاوێژت پێدەکەن؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر. ج- هەندێجار.

٣- ئەگەر ڕۆژێك ناکۆکی کەوتە نێوانی تۆو یەکێك لە هاوڕێ نزیکەکانت، هەوڵ دەدەیت قەناعەت بە بۆچوونەکەت بکات؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر. ج- هەندێجار.

٤- ئایا دەتوانیت چارەسەری گونجاوو خێرا دابنێیت بۆ ئەو کێشەو گرفتانەی ڕۆژانە بەرەو ڕووت دێن؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر. ج- هەندێجار.

٥- ئایا پارێزگاری لە نهێنی ئەو کەسانە دەکەیت، کە متمانەیان پێتەو نهێنییەکانی ژیانیانت بۆ باس دەکەن؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر. ج- هەندێجار.

٦- ئایا ئامادەیت بۆ هاوکاریکردنو یارمەتیدانی ئەو کەسانەی پێویستیان پێتە؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر. ج- هەندێجار.

٧- ئایا هاوڕێکانت پێت دەڵێن تۆ زۆرباش لە ناخی ئێمەو لە قسەو هەستمان تێدەگەیت؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر. ج- هەندێجار.

٨- ئایا بەهۆی ئەو سەرکەوتنانەی لە چالاکییە جۆربەجۆرەکاندا بە دەستت هێناون، زۆرێك لە دەوروبەرت پیرۆزبایت لێدەکەن؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر. ج- هەندێجار.

٩- ئایا بەردەوام هەواڵی هاوڕێ دێرینەکانت دەپرسیت؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر. ج- هەندێجار.

١٠- ئایا دەتوانیت بە تەنها ڕووبەڕووی کۆمەڵێك کەس قسە بکەیت؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر. ج- هەندێجار.

ئەنجام:

* ئەگەر زۆربەی وەڵامەکانت (بەڵێ)یە، ئەوا تۆ کەسێکی زۆر کۆمەڵایەتیت، بەختەوەرو ئاسوودەیت، خۆشەویستی لە نێو خەڵکیدا، بەهۆی ئەو تێکەڵاوییو هاوکارییەت بۆ دەوروبەرت، هەمیشە خەڵکی گومانی باشت پێدەبەنو خۆشیان دەوێیت، ئەم ئەنجامە نایابەت پیرۆز بێت.

ئامۆژگاری: ئاگاداربە، بەو هۆیەوە دووچاری لە خۆبایییبوون نەبیت، هەمیشە لە خۆبایبوون سەرەتای ڕووخانە، بەڵام لەسەر هەمان ڕێچکە بەردەوام بە، خۆشەویستی دەوروبەرت بەدەست دێنیت.

* بەڵام ئەگەر زۆربەی وەڵامەکانت (نەخێر) بوو، ئەوا تۆ خۆت بێبەری کردووە، پێش ئەوەی کەسانی دەوروبەرت بێبەری بکەیت، تۆ کەسێ‌ی گۆشەگیریتك، خۆپەسەندکردن نیعمەتێکی گەورەیە، کە لەوانەیە تۆ لە دەستی بدەیت بەهۆی نەگونجانت لەگەڵ دەوروبەرەکەتدا.

ئامۆژگاری: لە ناخی خۆتدا پیش مەخۆرەوە، دڵت بۆ دەوروبەرت بکەرەوە، سەرەتا بۆ خێزانەکەت، پاشان بۆ هاوڕێکانت، چونکە ئەوان کۆمەڵگەی بچووکی تۆن، ئاوێنەی وێنەی کۆمەڵایەتی ڕاستەقینەی تۆن، کە تیایدا سنوری پەسەندی کۆمەڵایەتی تۆی تیادەردەکەوێت.

* ئەگەر زۆرێك لە وەڵامەکانت (هەندێجار)ە، ئەوا تۆ لە ناوەڕاستی ڕێگەدایت، بۆ پەسەندکردنو هێنانەدی ئامانجەکانت، لاواز مەبە، هەوڵو تواناکانت کۆبکەرەوە، دەتوانیت چاکەکردن لەگەڵ دەوروبەرت، سەرنجیان بۆلای خۆت ڕابکێشیت، خەندەیەکیان پێشکەش بکە کە لە ناخی دڵەوە هەڵقوڵابێت، هەمیشە شوێنی گومانی باشی خەڵکی بە.

ئامۆژگاری: سەرکەوتنت لە هەندێ کاتدا، لە سەرنجڕاکێشانی دەوروبەرتدایە، ئەگەر لە هەوڵدانو یارمەتیدانو هاوکاری کەسانی دەوروبەرت بەردەوام بیت، لە ئایندەدا هەلی سەرکەوتنت زیاد دەکات، بەردەوامبەو دوودڵ مەبە.

پەیمان غەمگین



# منالّی دوێنێ من بووم، منالّی ئەمڕۆش براکەمە، منالّی سبەینێش منالّەکەمە!

کەواتە من دوێنێ زۆر لاساربوومو هەر خەریکی شەڕو ئاژاوەبووم، ئەمڕۆ ئامۆژگاری براکەم دەکەم، تا ئەوکارانەی من دووبارە نەکاتەوە، کە لەمنالّیدا دەمکرد، سبەینێش سود لەو پەروەردەیە وەردەگرمو منالّەکەم زیاتر بۆ ڕێنمونی دەکرێت.

مەبەستی من لەم بابەتە، پەروەردەیەکی ڕەوشتبەرزیو ئاکاری جوانە، بە بەردەوامیو بێپچڕان لە هیچ ئاستێك، بەبێئەوەی کەمو کوڕییەکانی خۆمان بەسەر ئەواندا دووبارە بکەینەوە، کاتێك ئێمە منالّ بووین، هەموو دەوروبەرمان شەڕکردن بوو، ساتەوەختەکانی منالّیمان هەمووی لە نێو دەنگی کلاّشینکۆفو بیکەیسیو تۆپو جبەخانە بووە، هەربۆیە کاتێك منالّ بووین، هەردەمانتوانی هێرش بکەینو بیر لەشەڕکردن بکەینەوەو پەنا ببەینە بەر سیناریۆی زالّبوون بەسەریەکتردا، ئەوە منالّی ئێمە بوو، با بەراوردێك بکەین لە نێوان منالّی دوێنێو منالّی ئەمڕۆ.

- منالّی دوێنێ، خەریکی شەڕەبەردو هێرشکردنو دەرخستنی باسكو بازوو بوون.

منالّی ئەمڕۆ، خەریکی شەڕەنامەن، هێرشەکانیان ئەلیکترۆنین..

- منالّی دوێنێ، خەریکی هێرشکردنە سەرگەڕەکی دراوسێکانیان بوون، بەمەبەستی شەڕکردن لەگەڵیاندا.

منالّی ئەمڕۆ، ئەگەر چی هێرش دەکاتە سەرگەڕەکی دراوسێیان، بەلاّم مەبەستیان شتێکی ترە، ئەویش خۆشەویستی، وەك دەبینین ئێستا منالاّن لەو سەری کۆلاّن بەدوای کچێکەوە دێن بۆ کۆلاّنەکەی ئەو سەر. ئەم شتانەی وتم جیاکاری نێوان منالّەکان نییە بە وردی، بەلاّم بەگشتی باسم کردووە.

هۆکاری چییە منالّی دوێنێ وابوو، منالّی ئەمڕۆش وایە؟

١- منالّی دوێنێ هەر شەڕی دەبینی، بۆیە هەرشەڕکردنی ئەدادەکرد، منالّی ئەمڕۆ تەنها ئەوەی دەبینێت لە کەنالّە ئاسمانییەکان، چیرۆکی خۆشەویستیو دلّدارییە، بەڕادەیەك سنوری تێپەڕاندووە.

٢- منالّی دوێنێ دایكو باوکیان دەرفەتیان کەم بوو بۆ بەسەرکردنەوەیان، بەلاّم منالّی ئەمڕۆ زۆربەی خواستەکانی هاتوونەتە دی.

٣- منالّی دوێنێ تورەنەبوو، بەلاّم تورەیان کردبوو، منالّی ئەمڕۆ تورەناکرێت، خۆی تورەدەکات.

٤- منالّی دوێنێ بێناز بوو، بۆیە کەسێکی دلّڕەق بوو، بەلاّم ئەوەی ئێستا زۆرنازی پێدراوە، لەگەلّ ئەوەی دلّنەرمیش نییە.

چی بکەین تامنالّی ئەمڕۆمان لە دوێنێ نەچێو بەیانیشمان باشتر بێت.

١- دەبێت ئەو بیرۆکانە بسڕینەوە کە مانای خۆسەپاندن دەبەخشن، وەك بڕیاردان بەسەریەکا، فەرمانکردن وەك ئەوەی مەجال بۆ گفتوگۆ نەمێنێت.

٢- منالّەکانمان پشتگوێ نەخەین وەك منالّەکانی دوێنێ، هێندەش نازیان پێنەدەین، وەك منالّەکانی ئەمڕۆ، تاکو بەیانی منالّێکی گوێڕایەلّمان هەبێت.

٣- تەواوی دەرفەتمان ببەخشین بە پەروەردەکردنی منالّەکانمان، نەك دەربڕینی وەڕەسی لەبەردەمیان.

٤- تێگەیاندنی منالّ لە ڕقو خۆشەویستی، بۆئەوەی جیایان بکاتەوە، چونکە هەردوو جۆر، زیان بە مرۆڤ دەگەیەنن، ئەگەر ڕێسایەك نەبێت بۆ تێگەیشتن لێیان.

هیوادارم منالّی دوێنێو ئەمڕۆ منالّی وەك خۆیان نەهێننە بوون، تامنالّی سبەینێمان منالّێکی شەڕانگێز نەبێت...

و: لە تورکییەوە: ئیمان ناصح



# بەختەوەری لەچیدایە؟

کابرایەکی گوندنشین بۆ سکاڵاکردنی حاڵی خۆی چووە لای زانایەکو پێی گوت: تکایە یارمەتیم بدە خەریکە شێت دەبم، لەگەڵ هاوسەرو منداڵەکانم لە خانوویەکی تەنها یەك ژووریدا دەژیم، زۆرکات خزمو کەسو کاری خێزانەکەشم دێن، تەواو هەمووومان لەم حاڵە بێزاربووین، هەر یەکەو بەرامبەر ئەوی تر هاوار دەکات، ژوور هەروەك دۆزەخی لێهاتووە، ئیدی ئارامیمان لێبڕاوەو چیدی توانای قبوڵکردنی ئەو ناڕەحەتیو ناهەمواریو نەبوونییە ناگرین، تکایە چارەسەرێك، ڕێنموویییەکمان بکە، تا لەو ناڕەحەتییە ڕزگار بین!!

زاناکە بەدەنگێکی کاریگەرو ئارامەوە وەڵامی دایەوەو وتی: بەڵێن دەدەیت گەر هەر شتێکم وت بەقسەم بکەیت؟

کابرای گوندنشین لە وەڵامدا گوتی: بەڵێن بێت، بەڵێن، هەرچی بڵێیت بەقسەت بکەم.

زاناکە: باشە کەواتە لەماڵەوە چەند سەر ئاژەڵت هەیە؟

کابرای گوندنشین: مانگایەکو بزنێکو ٦ مریشك!

زاناکە وتی: کەواتە دەبێت ئاژەڵەکانیشت ببەیتە لای خۆتانو لەژوورەکەدا لەگەڵ خۆتان بن ئەوە بکەو دوای هەفتەیەکی تر وەرەوە بۆ لام!

پیاوە گوندنشینەکە زۆر سەری سوڕما، بەڵام لەبەرئەوەی بەڵێنی دابوو، هیچ قسەیەکی نەکرد، هەر بۆیە ئاژەڵەکانیشی بردە ژوورەکە بۆلای خۆیان!

هەرچۆن بوو ماوەی هەفتەکە گوزەری کرد، کابرای گوندنشین بەحاڵێکی پەرێشانەوە گەڕایەوە لای زاناکەو بەدەردی بێ حاڵییەوە دەیناڵاندو وتی: تەواو گرفتاربووین، پیسیو بۆنو دەنگەدەنگو ژاوەژاو عەقڵی لەسەرکەسماندا نەهێشتووە!

زاناکە لە وەڵامدا گوتی: ئێستا بڕۆ ئاژەڵەکان ببەرەوە دەرەوەی ژوورەکەتان!

کابرا بە خێراییو بێ هیچ وەستانێك خۆی گەیاندە ماڵەوەو دەستبەجێ ئاژەڵەکانی بردە دەرەوەی ژوورەکە.

ڕۆژی دوایی کابرای گوندنشین دووبارە گەڕایەوە لای زاناکە، بەڵام ئەمجارە جیاوازبوو، ڕووی دەدرەوشایەوەو چاوەکانی لە خۆشحاڵیدا دەبریسکانەوە، دەستی بە قسەکردن کردو وتی: ئای ژیان چەندە جوانە، ئاژەڵەکانم بردە دەرەوەی ژوورەکەمان، ئێستا ماڵمان هێندە بێدەنگە، هێندە پاكو خاوێنو فراوانە، هەر وەك ئەوەی بەهەشت بێت!

نوسینی: مورات چیفت کایا

و: بەهرە عەلی



# لێوردنێکی دەگمەن

لەو ڕووداوە سەرسوڕهێنەرانەی کە گێڕدراوەتەوە لە کاتی ئازادکردنی ئەندەلوسدا، گەنجێکی ئیسپانی لەگەڵ گەنجێکی عەرەبیدا دەبێتە شەڕو هەرایان، لە ئەنجامدا گەنجە ئیسپانییەکە گەنجە عەرەبەکە دەکوژێت، دواتر ڕادەکات تا دەگاتە باخێك، خۆی دەکات بەنێو باخەکەداو پیاوێکی ڕدێن سپی بەساڵاچووی بینی، بە هەناسەبڕکێو پەشۆکاوییەوە ڕووداوەکەی بۆگێڕایەوەو داوای لێکرد بە هانایەوە بێتو حەشاری بداتو ڕزگاری بکات لە دەستی دوژمنەکانی، ئەویش بردییە شوێنێکی چۆڵو شاردییەوە.

دوای ماوەیەك هاوارو قیژە لەبەردەم ماڵەکەدا بەرزبووەوە، هەندێك خەڵك هاتنەژوورەوەو تەرمی کوڕە کوژراوەکەیان هێنایە ژوورەوە بۆ لای باخەوانی ڕدێن سپی، کاتێك سەیری کرد، بینی کوڕەکەی خۆیەتی، ئەم ڕووداوە زۆر نیگەرانو تووڕەو ناڕەحەتی کرد، بەڵام خەفەتو تووڕەبوونەکەی خۆی کپکردەوە، ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی کوڕەکەی بەڕێوەچوو، کاتێك شەوداهاتو دنیا بێدەنگو خامۆش بوو، هەستا ڕۆیشت بۆ لای بکوژەکەو پێی گوت: ئەو کەسەی تۆ کوشتووتە کوڕەکەی منە، ئەویش زۆر ترساو دڵی هاتەلەرزەو مردنی خۆی هاتەپێشچاو، بەڵام باخەوانی ئارامگرو ڕدێن سپی: ئارامی کردەوەو ترسەکەی ڕەواندەوەو پێی وت: ئەوە پارە بۆ پێداویستیو سەفەرەکەت و ئیدی بڕۆ!

گوڵان حەمەئەمین



# لەپشت چاتەکانەوە چی ڕوودەدات؟!

ئەمڕۆ ئینتەرنێت بووەتە یەکێك لە پێویستییەکانی ڕۆژانە، لە زۆرێك لە ماڵەکاندا بە کاردەهێنرێت، لە هەموو بوارەکانی ژیاندا سوودی زۆرو لە ڕادەبەدەری هەیە، ڕێگا دوورەکان نزیك دەکاتەوە، کارە گرانەکان ئاسان دەکات، هیچ کات ناکرێو نەگونجاوە کە بوترێت، زیانی زۆرە، چونکە لە ڕاستیدا سودو زیانەکانی پەیوەستە بە کەسی بە کارهێنەرەوەو هەر ئەو کەسەی کە بە کاری دەهێنێت بڕیار دەدات بۆ زانست و زانیاریو بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیریو پەرەپێدانی لایەنی پەروەردەییو ڕۆحی، بەکاری دەهێنێت، یاخود بۆ تێکشکاندنی ناخو ڕەوشتو بیروهۆشو تواناو وزەکانو بە هەدەردانی زۆرێك لە کاتەکان بە کاریدێنن؟

قسەکردن لە ڕێگەی چاتەوە بۆتە نەریت، بەتایبەت لە کوردستانی خۆمان زیاتر ئینتەرنێت بۆ ئەو مەبەستە بەکاردێت، بە هۆی ئەوەی کە تۆڕێکی چڕو بەربڵاوو بێ سانسۆرە، جێی داخە کە نەك تەنها کات بە هەدەر دەدرێت لە ڕێی چاتەکانەوە، بەڵکو فێڵو دەستبڕینو درۆو شکاندنی سنورەکانی ڕەوشتو بەها ئەخلاقییەکان لای زۆرێك لە لاوان بووەتە نەریت!

لە چاتەکاندا کوڕ خۆی دەگۆڕێت بۆ کچ، کچ خۆی دەکات بە کوڕ، هاوڕێیان خۆیان دەکەنە نامۆ لای یەکدی، لەو ڕێگەوە ئەو کوڕانەی خۆیان بە کچ نیشاندەدەن، سەنت لە کوڕان وەردەگرنو تا دەتوانێت قسەی ناسكو زرقو بریقیان لەگەڵ دەکەنو بەڵێنی بێ مانایان پێدەدەن، کاتێکیش ئیشی پێیان نەما دەنووسێت من "..." نیم، بەڵکو "..." هاهاها!

کەسێك لەوانەی لە ڕێی چاتەوە خۆی دەگۆڕێت وتی: لە ڕێی چاتەوە قسەم لەگەڵ کەسێك کرد لەو کەسانەی ئەم ناسین، بەڵام بە ناوی کچەوە قسەی زرقو بریقم لەگەڵ کرد، لە دواییدا هەر جارێك دەهاتە سەر خەت داوای دەکرد قسەی لەگەڵ بکەم، منیش پێم دەوت باڵانسی مۆبایلم بۆ نەنێری قسەت لەگەڵ ناکەم، سەرەنجام نزیکەی دووسەد دۆلارم پێ خەرجکرد!! نەیزانی کوڕەو یەکێکم لە هاوڕێکانی خۆی! بەڕاستی ئەمە جێی داخە نیشانەی دواکەوتوییو بێ سەلیقەیی ئەو گەنجانەیە، وێڕای ئەوەی فێڵو دەستبڕینو درۆو، خیانەتو بەدڕەوشتی، زۆریش دەکرێتو لە ڕێی کامێرای چاتەکانەوە، بێ هەستکردن بە چاودێرێکی مەزنو خاوەن شکۆ، بێ شەرمو بێ ئابڕوانە، وێنەی نەشیاوی خۆیان بۆ یەکتر نمایش دەکەن، وەك ئەوەی نەچاودێر هەبێت نە بەهاو ڕەوشت، لە کاتێکدا کامێرای نهێنی لەسەر تۆڕەکان دادەنرێتو بێئەوەی بزانن زۆرێك لەو وێنانە لەماڵپەڕەکاندا کە بەهای ئەخلاقی ڕەچاوناکەن ئەو وێنە نەشیاوانە کە بە شێوەیەکی نەگونجاو بۆ کەسێکی تایبەت نمایش کراوە، لە ماڵپەڕەکانیان بڵاودەکرێتەوە!! جێی خۆیەتی هەموو بەکارهێنەرانی ئینتەرنێتو سەرجەم چاتکارانیش هەڵوێستەیەك بکەینو چەند سنورێك بۆ خۆمان دیاری بکەین:

١- چاودێرێك هەمیشە چاودێریمان دەکات، گەر شەرم لەو نەکەین ئیدی شەرم هیچ نرخێکی نییە!

٢- کات زۆر لەوە گەورەترو بە نرخترە کە چەندین کاتژمێر بەدیار چاتەکانەوە بە هەدەربدەین!!

٣- با ئینتەرنێت بکەینە هۆکاری بەهێزکردنی لایەنی ڕۆشنبیریو بەرزکردنەوەی ئاستی زانستیو پەروەردەییو ڕۆحی.

٤- فێڵ بۆ؟! درۆ بۆ؟! پێت خۆشە ئەوەت لەگەڵ بکرێت کە تۆ بەرامبەر کەسانی دی ئەنجامی دەدەیت؟ ساتێك بیر بکەرەوە، بزانە ئەوەی تۆ لە ڕێی چاتەکانەوە ئەنجامی دەدەیت، یاخود ئینتەرنێت بۆچی بەکاردێنیت؟ تاچ ئەندازەیەك خزمەتت پێدەکات؟ یاخود ئایە دەتوانیت بە شانازییەوە لە نێو مامۆستا، یاخود دایكو باوکتدا لە ژێر چاودێری ئەواندا بەکارهێنانەکانت نمایش بکەیت؟ ئەگەرنا ئەی بۆ شەرم لە چاودێرێکی گەورە ناکەیت؟!

سارا بەرزنجی

# القوانين الأخلاقية
## یاساکانی ڕەوشت!

*** زین أخلاقك بالصدق والامانة.**

ڕەوشتو ئاکارت بە ڕاستگۆیی‌و دەستپاکی بڕازێنەوە.

*** في العفو لذة لانجدها في الانتقام.**

لە لێبوردندا لەزەتو خۆشییەك هەیە، کە هەرگیز لە تۆڵەسەندنەوەدا بەدیناکەین!

*** الوقت ليس مبكرا على التسامح، وليس متأخرا عن ان نتسامح.**

کات زوونییە بۆ لێبوردن، هەروەها درەنگیش نییە بۆلێخوشبوون!

***إلتمس لاخيك الاعذار دوما، كي لاتظلمه.**

هەمیشە پۆزشبێنەوە بۆ براکەت، تا هەرگیز ستەمی لێنەکەیت.

*** انشر الود بين الناس، وأصلح بين المخاصمين.**

* خۆشەویستی لە نێوان خەڵکیدا بڵاوبکەرەوەو ئەو کەسانەش ئاشتکەرەوە کە نێوانیان ناخۆشە لەگەڵ یەکدا.

*** إفشاء السلام يعزز المحبة والوئام.**

سڵاوکردن خۆشەویستی‌و تەبایی بەهێزتر دەکات.

*** العطاء سعادة.**

بەخشین بەختەوەرییە.

*** راقب كلامك وحاسب لسانك.**

چاودێری قسەکانت بکەو لێپرسینەوە لە زمانت بکە.

*** التواضع يصنع العطاء.**

سادەیی‌و تەوازوع بەخشینی بەردەوام دروستدەکات.

*** عاون الناس وساعدهم، لتجدهم حين تحتاج اليهم.**

هاوکاری خەڵك بکەو یارمەتییان بدە، بۆئەوەی لە کاتی تەنگانەدا کاتێك پێویستت پێیان دەبێت، بیانبینیت.



# ژیان فێری کردم

ژیان فێری کردم: تەنها دوو ڕێگە هەیە بۆئەوەی ببیتە خاوەنی بەرزترین باڵەخانە، یان دەبێت هەموو باڵەخانەکانی دەوروبەرت بڕوخێنیت، یاخود دەبێت باڵەخانەیەك دروست بکەیت، کە لە هەموو باڵەخانەکانی دەوروبەرت بەرزتر بێت، مرۆڤی ژیر هەمیشە ڕێگەی دووەم دەگرێتەبەر!

ژیان فێری کردم: هاوسەنگی وا لە مرۆڤ دەکات کە بەردەوام هەست بە بوونی خۆی بکات، مرۆڤی هاوسەنگ بەوپەڕی هێمنی‌و متمانەبەخۆبوونو سەرکەوتنەوە، ڕووبەڕووی هەمووبارودۆخو هەڵوێستە جیاوازەکان دەبێتەوە، مرۆڤی هاوسەنگ ڕقی لەو ڕۆژە نییە کە دوێنی خۆشی ویستووە، هاوسەنگ بەیانیان ڕووخۆش نییەو ئێواران ڕووگرژو تاڵ، مرۆڤی هاوسەنگ هەرگیز توڕە نابێت، هیچ کات دوودڵو نیگەران نابێت.

ژیان فێری کردم: هاوسەنگی سەرچاوەی ئارامییە، کۆنترۆڵکردنی دەروونو زاڵبوونە بەسەر هەواو ئارەزووەکانو متمانەبەخۆبوونە، مرۆڤی هاوسەنگ بارودۆخو ئارەزووەکان ناتوانن دەستی بەسەردابگرن، بەڵکو ئەو دەتوانێت ڕووبەڕوویان بێتەوەو بەسەریاندا زاڵو سەرکەوتوو بێت.

ژیان فێری کردم: ئەگەر خەمێك، یان گرفتێك ڕووی تێکردیت، لە تۆ بەهێزترو بە تواناتر بوو، پارێزگاری لە ئارامی‌و لەسەرخۆی‌و ڕووخۆشیت بکە، بەتایبەت لەو کاتانەدا کە دوژمنەکانت واچاوەڕێ دەکەن، کە تۆ شکست بهێنیت، لەو کاتەدا بڵێ: بێگومان ڕۆژی منیش دێت بۆ سەرکەوتنو گەیشتن بە هیواو ئاواتەکانم.

ژیان فێری کردم: بەختی باش پەیوەستە بە نەستی مرۆڤەوە، کە پێشوازی لە جۆرەها ئیلهامو بیرۆکە دەکات، تا مرۆڤ لە تێبینی‌و تێڕامانەکانییەوە پێی بگات، هەر لە متمانەبەخۆبوونو هیواو ئارەزووی سەرکەوتنو ئارامگرتنو ڕاهاتن لەسەر دژوارییەکانو هەنگاونان بەرەو گۆڕەپانی کارکردنو بەدیهێنانی نەریتی نوێ‌و توانای خۆگونجاندنو ... هتد، لە کۆتایشدا هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ئەو توانایانەی کە لە خودی خۆیدا حەشاردراوە، کە تەنها خۆی هەستی پێدەکاتو کەسی دی ناتوانێت هەستی پێبکات!

ژیان فێری کردم: دەستم بکەمەوەو پەنجەکانم واڵابکەم، پاشان دەستم سەربەرەوخوار هەڵگێڕمەوە، وابێنمە پێشچاوی خۆم کە ئەوەی لە نێو دەستمدایە بریتییە لە خەموپەژارەو دڵتەنگی‌و بیرۆکە ڕەشبینەکان، بە هەڵگەڕانەوەی دەستم دەکەونە خوارەوەو ئیدی لە نێو دەستمدا نامێنن!

ژیان فێری کردم: ئەگەر مرۆڤ ویستی کارێك ئەنجام بدات، بێگومان دەتوانێت ئەنجامی بدات، بە مەرجێك بیر لە بیرۆکەی نەرێنی‌و وشەی ڕووخێنەر نەکاتەوە!

ژیان فێری کردم: هەمیشە بە هەنگاوی یەکەم هەڵسەو ئەو کارەی دەتەوێت ئەنجامی بدەیت، ئەنجامی بدە، دڵنیابە هەموو ترسو دڵەڕاوکێیەك بە تێپەڕبوونی کات دەڕواتو نامێنێت.

ژیان فێری کردم: پیاوی خاوەنکاری سەرکەوتوو ماڵو سامانەکەی بە هۆی تواناو شارەزاییەکانییەوە کۆناکاتەوە، بەڵکو زۆربەی جار بە هۆی هەڵەکانییەوە دەبێتە خاوەن سەروەتو سامان.

ژیان فێری کردم: ئەگەر مرۆڤ لە یارییەکدا، یان لە وەرزشێکدا کاتێکی خۆشی بەسەربرد، ئەوا براوەیە ئەگەرچی ئەنجامەکەشی بدۆڕێنێت!

ژیان فێری کردم: زۆربەی ئەو کەسانەی مایەپووچ دەبن، ئەو کەسانەن کە حەماسەتو پەرۆشییان بۆ کارەکەیان لە دەست دەدەن!

ژیان فێری کردم: کە هیچ شتێکی قورس لەم ژیانەدا بوونی نییە ئەگەر بکرێتە پارچەی بچووك بچووك!

ژیان فێری کردم: هیچ مرۆڤێك بەرلەوەی تاقیبکاتەوە نازانێت، چی باشە، یان چ کارێك بکات، یاخود چی بەدەستبهێنێت.

وەهاب حەسیب محەممەد



بەشی یەکەم

# گوێگرتن Listening

لە مێژە گوتراوە (بەڵگەی ژیری بیرکردنەوەیەو بەڵگەی بیرکردنەوە بێدەنگییە)، بەڵام هونەری گوێگرتن بنەماو بناغەی تایبەت بە خۆی هەیە، ئەگەر هەردوو لایەنی گفتوگۆکەی تێدا نەبوو ئەوا لە ئامانجەکانی خۆی دووردەکەوێتەوەو کێشەیەك دروستدەکات. پرسیارکرا لە یەکێك لە سەرکەوتوترین پیاوەکانی بەڕێوەبردنی کار دەربارەی گرنگترین تواناکانی، لە وەڵامدا وتی: توانای گوێگرتنی هەیەو ئاواتی ئەوەیە قوتابخانەیەك بکاتەوەو ناوی بنێت (گوێگرتنی کارا)، تا هەموو ئەوانەی هاوبەشین کاتێك کارێکیان دەدرێتە دەست لە توانایاندا هەبێت کۆمەڵێك خەڵك بەڕێوەبەرن. هەندێك وایدەبینن کە چارەسەری کێشەکان بەدەر لە جۆرو شێوازیان بریتیە لە گوێگرتن، زیادەڕەوی نییە ئەگەر بڵێین ئەم هونەرە یەکێکە لەو توانایانەی خەڵك پشتگوێیان خستوەو گرنگی پێنادەن.

گوێگرتن لە زماندا: واتا تێگەیشتن لە گوتەی بەرامبەر، گوێم لە قسەکەی بوو واتا لە وتەکانی گەیشتم.

چەمك (مەبەست)ی گوێگرتن:

گوێگرتن کردارێکە لە کردارەکانی پەیوەندی لە نێوان مرۆڤەکاندا ڕوودەدات، بە هۆی هۆکارەکانی گەیاندنەوە لە گفتوگۆکەدا دوو لایەنی تیادا دەبینرێت.

لایەنی نێرەر: بە شێوەی گفتوگۆ، یان لە ڕێگای نوسینەوە دەبێت.

لایەنی وەرگر: ئەمەشیان لە ڕێگەی خوێندنەوە، یان گوێگرتنەوە دەبێتو هەردوو شێوازەکە لە ڕووی لۆجیکەوە پێویستە تێگەیشتنی تیادا بێت.

گوێگرتن بریتییە لە تێگەیشتنو بەئاگابوون لە شتێکی بیستراو، وەك گوێڕادێران بۆ ئاخێوەر، بەپێچەوانەی بیستنەوە کە ئامرازەکەی گوێیە بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین گوێگرتن کردارێکی فسیۆلۆجییە، دروستبونی وەستاوەتە سەر سەلامەتی گوێ.

پێناسەی گوێگرتن: هاریس (Harris) گوێگرتن بەم شێوەیە پێناسەدەکات: کردارێکی فسیۆلۆجییە دەوەستێتە سەر دڵنیایی گوێچکەو پێویستی بەکاری گوێچکەو ئاگایی هەیە، بۆ سەرچاوەی دەنگەکە.

محەممەد روشدی دەڵێت: (الإنصات) بریتییە لە: چڕکردنەوەی ئاگایی لەوەی ئادەمیزاد دەیبیستێت لە پێناو ئامانجێکی دیاریکراودا، یان مەبەستێك دەیەوێت بەدیبێنێت.

لەم ڕاڤەکردنەوە دەتوانین بڵێین جیاوازی لە نێوان (الإستماع والإنصات): لە پلەو چۆنییەتی گوێگرتنەکەدایە نەك لە سروشتی ئەدای گوێگرتنەکە.

نموونەی ئیستماع گوێگرتنی قوتابییە لە مامۆستاکەی، ماوەیەك گوێڕادێرێت، پاشان خەیاڵی بەلایەکی تردا دەڕواتو هەندێجار دەنگەدەنگێك لە دەرەوەی پۆل

پەتی گوێگر دەپچڕێنێت، یان خوێندکار بێزار دەبێتو گوێناگرێت، بەڵام هەرچی ئنصاتە گوێگرتنە بە تەواوی بەشێوەیەکی بەردەوامو بە تەواوی ئاگادارییەوەیە.

گرنگی گوێڕادێران: لەمێژە گوتراوە فێربە بەباشی گوێبگریت بەرلەوەی فێربیت بەباشی بئاخفی، لە میانەی گوێگرتنەوە بەدرێژایی چەندین سەدە زانیاریو پاشماوەی مرۆڤایەتی دەم بەدەمو نەوە بەنەوە گەیشتونو لە فەوتان پارێزراونو لەو ڕۆژگارەدا ئاخێوەر سەرچاوەی دەمپاکیو ڕاستگۆیی بووە، گوێگریش هەمان تێڕوانینی هەبووە بەرامبەری. دەرکەوتووە ئادەمیزاد لە خولەکێکدا لە توانایدایە ١٢٥ وشە بدرکێنێت، بەڵام هاوکات لە توانایدایە ٥٠٠ وشە ببیستێت.

پەیوەندی نێوان کارگێڕیو گوێگرتن:

لە لێهاتووییە سەرەکییەکانی بەڕێوبەر بریتییە لە گوێگرتن لە کەسانی دیکە. ئەمەش مانای ئەوەنییە هەرچییەکی بیست جێبەجێی بکات، واتای گوێگرتن لێرەدا بریتییە لە تێگەیشتن لە بیروڕاو داواکارییەکانی کەسانی تر، ئەمەش یارمەتیدەری بەڕێوبەرە لە دەرکردنی بڕیاری دروست، ئەگەر بەڕێوبەر گوێڕا نەدێرێت ئەوا توشی کێشەی زۆر دەبێت.

بۆچی گوێگرتن پێویستە؟ گوێگرتن لێهاتوییەکی کارگێڕییە، چونکە وادەکات ئاشنا بین بەو شتانەی نایزانینو هەستی پێناکەین. گوێگرتن یارمەتیدەرە بۆ زانینی پێداویستی بۆچونو هەستی ئەوانیتر. گوێگرتن یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتن لە کارمەندانو بیرکردنەوەیانو تێگەیشتن لە سروشتی هەمیشە کڕیارەکان، یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتن لە دابینکەران، یارمەتیمان دەدات لە توانای هاوڕێو هاوکارەکانمان بگەین.

کاتێك بەڕێوبەر گوێ شل دەکات بۆ بەردەستەکانی سەبارەت بەکێشەکانیان، ئەم گوێڕادێرانە هۆکارە بۆ بەرزبوونەوەی وزەی ناخی بەردەستان، هاوکات کاتێك بەڕێوبەر گوێدەگرێت لە هەمیشە کڕیارەکانو بۆچونەکانییان ئەمە بۆ خۆی ئەو قەناعەتەیان لادروست دەکات کە ئەم کۆمپانیایە بەڕێزەو لە هەوڵدایە بۆ ڕازیکردنی کڕیارەکانی.

چۆنییەتی گوێگرتن: تۆ دەتەوێت زانیاری دەربارەی کەسێك بزانیت وەك تێڕوانینی ئەو دەربارەی کێشەیەك، یان ڕاڤەی ئەو دەربارەی کردارێك. گرنگە بەشێوەیەك گوێی لێبگریتو بتوانیت ئەو زانیارییانە بە شێوەیەکی ئاشکرا بەدەست بهێنیت بەمشێوەیە:

١- گوێگرتن بە شێوەیەکی باش، واتە جەختکردنەوەو بیرڕوونی بەرامبەر ئاخێوەر.

٢- تەماشاکردنی ئاخێوەر بە گرنگی پێدانەوە.

٣- خۆخەریکنەکردن بەکاری ترەوە، وەك قسەکردن لەگەڵ کەسانی دیکە، یاخود خۆخەریککردن بەنووسینەوە.

٤- هاندانی ئاخێوەر بۆ دەربڕینی ڕای خۆی، ئەمەش بەدروستکردنی کەشێکی ئازاد، ئەوەش بە ئاماژەکردن بەسەرو ئاڕاستەکردنی چەند پرسیارێك دەبێت.

٥- ئاڕاستەکردنی چەند پرسیارێکی کراوە، وەك کەشی کار بەلاتەوە چۆنە؟

٦- هەستانو دانیشتنت بە شێوەیەك بێت کە تەوازعی تۆ پیشان بدات.

٧- قسە نەبڕین بە ئاخێوەر.

٨- دڵنیابوون لەوەی لە وتەکانی ئاخێوەر بە تەواوی گەیشتویت.

٩- پەلەنەکردن لە بڕیاردان لەسەر قسەکانی ئاخێوەرو گوێگرتن تا کۆتایی وتەکانی.

١٠- نووسینەوەی هەندێك لە ڕستەکانی ئاخێوەر ئەگەر زانیت گفتوگۆکە درێژە دەکێشێت.

١١- با پەرچەکردارت پەلەکردنی تیادا نەبێت، ئەگەر وتەکانی کەسی بەرامبەر هەڵگری ڕەخنەو گازندە بوون، بەرامبەر بە تۆ، یان بڕیارەکانت ئارامگربە، دەنا کەس ڕەخنەو گازندەت ئاڕاستە ناکاتو دەربارەی هیچ کێشەیەك ئاگادارت ناکەنەوە.

ئەم کارانە هێندە گران نین، زۆربەیان ڕۆژانە لە خۆوە پیادەیاندەکەین، ئەگەر بمانەوێت بەڕاستی گوێبگرین.

دەکرێت ئەم خاڵانە بە چەند نموونەیەك شیکاربکەین بەم شێوەیە:

١- بەڕێوەبەر لە پشتی نوسینگەیەکی گەورەوە دانیشتووەو پێیەکانی لەسەر یەك داناوە، بانگی یەکێك لە بەردەستەکانی دەکات (م. هێمن). مامۆستا هێمن دێتە ژووری ڕووبەڕووی نوسینگەی بەڕێوبەر دەوەستێت، پاشان بەڕێوەبەر دەستدەکات بە گفتوگۆ: بەڕێز دەمەوێت زۆر بە ڕاشکاوانە پێم بڵێیت چ کەمو کوڕییەك لە شێوازی بەڕێوەبردنمدا هەیە؟

م. هێمن دەست بەقسەکردن دەکات: جەنابی بەڕێوبەر هیچ گرفتێك نییە.

سەرنج: لێرەدا (م. هێمن) حەز بە ڕووپامایی ناکات، بەڵام کەشەکە پاڵنەر نییە بۆ گفتوگۆ بەشێوەیەکی ئازادانە، چون بەڕێوەبەر لە پشت نوسینگەیەکی گەورەوە دانیشتووەو مامۆستا هێمن بەرامبەری ڕاوەستاوە، بەڵام ئەگەر بەڕێوەبەر بیگوتایە بەڕێز چ کێشەیەك هەیە، ئازادی تەواوت هەیە، بەڵام بیرت نەچێت من سەرۆکتم.

٢- لە سەرەتای کۆبوونەوەکەدا بەڕێوەبەر دەستپێدەکات: دەمەوێت ئەم کارەو ئەو کارە بکەم. با گفتوگۆبکەین دەمەوێت تێڕوانینتان بزانم.

سەرنج: لەسەرەتاوە بەڕێوەبەر هەموو کارێکی کۆتا پێهێنا، لەبەرئەوە کارمەندان بە هیچ شێوەیەك ناخوازن تێڕوانینێکیان هەبێت، پێچەوانەی بیروڕاکانی بێت تا پێکدادان لە ڕاوبۆچونەکانیاندا دروست نەبێت.

٣. بەڕێوبەر پرسیار لە یەکێك لە هەمیشە کڕیارەکان دەکات؟

بەڕێوبەر: ئایا بەڕێزتان ڕازین لە ئاستی خزمەتگوزارییەکان؟

هەمیشە کڕیار: بەڵێ.

بەڕێوبەر: ئایا؟ دامەزراوەکەمان بەلاتەوە پەسەندە؟

هەمیشە کڕیار: بەڵێ.

بەڕێوبەر: سوپاس

هەمیشە کڕیار: ببورە..

سەرنج: بەڕێوەبەر کۆمەڵێك پرسیاری داخراوی ئاڕاستەی هەمیشە کڕیارەکە کردووە، دواتر هیچ زانیارییەکی بەسودی دەستگیر نەبووە. هەمیشە کڕیار هیچ ماوەی نەدراوەتێ هەندێك کێشەکان بۆ بەڕێوەبەر ڕاڤە بکات. سەبارەت بە پرسیاری دووەم وەڵامێکی گران دەبوو ئەگەر هەمیشە کڕیارەکە بیگوتایە نەخێر ڕێکخراوەکەتانم خۆشناوێت.

# منداڵی یەکەممان نابینا بوو!

ئالانی

هێشتا تەمەنم ٣٠ ساڵ تێپەڕی نەکردبوو، کە یەکەم منداڵمان چاوی بە دنیا هەڵهێنا، بەردەوام بیر لەو شەوانە دەکەمەوە، کە تاکۆتایی شەوو نزیکی بەرەبەیان لە نێو قاوەخانەو چایخانەو پارکەکاندا لەگەڵ هاوڕێکانمدا دەمامەوە، تەواوی شەوگارە درێژەکانمان بە قسەی بێ ماناو توانجگرتن لە خەڵکی‌و باسکردنی ئەم‌و ئەو بەسەر دەبرد، بە زۆری من لاسایی کەسایەتییەکانم دەکردەوەو هاوڕێکانم دەخستە پێکەنین، لە ڕاستیدا خاوەنی بەهرەیەکی ناوازە بووم لە لاساییکردنەوەو گاڵتەپێکردندا، لە توانامدا بوو دەنگیشم بگۆڕم، وەکو ئەو کەسە قسە بکەم کە لاساییم دەکردەوە، کەس لە دەستم دەربازی نەدەبوو، تەنانەت هاوڕێکانیشم، هەربۆیە زۆرێک لە خەڵکی لێم دووردەکەوتنەوە بۆئەوەی لە بەڵای زمانی من سەلامەت بن.

لە بیرم دێت ئەو شەوە من زۆر پێکەنیم، گاڵتەم بە کوێرێک دەکرد کە بە نێوبازاڕدا دەسوڕایەوە، تا لێی نزیک بوومەوەو قاچم خستە بەرقاچی، ئەویش کەوت بەزەویدا، نەیدەزانی چی بڵێت، منیش بە پێکەنینەوە خۆم کرد بە نێو خەڵکەکەدا، ئیدی وەکو نەریتی هەمیشەییم درەنگانێکی شەو بۆ ماڵ گەڕامەوە، بینیم هاوسەرەکەم چاوەڕێم دەکات، هەستم کرد لە بارێکی خراپدایە، بە دەنگێکی کزۆڵەوە وتی: ئارام لە کوێ بوویت؟ منیش بە گاڵتەجارییەوە وتم: لە مەریخ! بێگومان لە ناو هاوڕێکانم.

ئیدی هاوسەرەکەم بەدەم هەڵوەرینی فرمێسکەکانییەوە وتی: من زۆر بێتاقەتم، ئازارم زۆرە، وادەزانم کاتی لە دایکبوونی منداڵەکەمان نزیکبووە، هەستم کرد، کە من هاوسەرەکەم زۆر فەرامۆش کردووە، پێویستە ئیدی گرنگی پێبدەم، تا کەمێک لە خەم‌و ئەرکی سەرشانی سووك ببێت، بە تایبەت ئێستا کە لە مانگی نۆهەمی سکپڕیدایە.

بۆیە بە خێرایی گەیاندمە نەخۆشخانە، بەردەوام ئازاری هاوسەرەکەم زیادی دەکرد، منیش زۆر چاوەڕێم کرد تا منداڵەکەی ببێت، بەڵام ماندووبووم لە چاوەڕوانی، ئیدی ئارامم لێبڕاو ژمارە تەلەفۆنەکەم جێهێشت تا ئەگەر منداڵەکەمان لە دایکبوو مژدانەم پێبدەن، گەڕامەوە ماڵ.

دوای کاتژمێرێك پەیوەندیم پێوەکرا، منیش بە خێرایی گەڕامەوە بۆ نەخۆشخانە، برین پێچەکەم بینی، داوام لێکرد کە ژووری هاوسەرەکەم پێ بڵێ، بەڵام ئەو داوای لێکردم سەرەتا بڕۆم بۆ لای ئەو پزیشکەی سەرپەرشتی لە دایکبوونەکەی کردبوو، منیش بە دەنگی بەرز بە سەریدا قیژاندم‌و وتم کام پزیشك؟ گرنگ ئەوەیە من کوڕەکەم ببینم!

بەڵام ئەو سوربوو لەسەر داواکەی‌و وتی: دەبێت سەرەتا بچیتە لای پزیشکەکەی.

بە ناچاری ڕۆیشتم بۆ لای پزیشك، دەستیکرد بە قسەکردن لە سەر ئارامگرتن لە کاتی تاقیکردنەوەو ڕازیبوون بە قەدەری خوای گەورە، پاشان پێی وتم، منداڵەکەت، نابینایە!

سەرم داخستو بۆ ڕابردوی خۆم دەستم کرد بە گریان، بیرم لەوە کردەوە کە پیاوە نابیناکەم خست بە زەویداو خەڵکی پێی پێکەنین!

نەمدەزانی چی بڵێم، پاشان بیرم لە هاوسەرەکەم‌و منداڵەکەم کردەوە، سوپاسی پزیشکەکەم کردو ڕۆیشتم بۆ بینینی هاوسەرەکەم!

هاوسەرەکەم ئافرەتێکی باوەڕدار بوو، باوەڕی پتەوی بە قەزاوقەدەر هەبوو، بینیم ئەو خەمبار نییەو سوپاسی خودا دەکات، ڕووی تێکردم‌و پێی وتم: ئیدی ئەوەندە گاڵتە بە خەڵکی مەکە، هەروەکو چۆن هەمیشە ئامۆژگاری دەکردم کە ئەوەندە باسی خەڵکی نەکەم.

لە نەخۆشخانە هاتینە دەرەوە، منداڵە نابیناکەمان ناونا سالم، لە ڕاستیدا من هیچ گرنگییەکم پێنەدەدا، وامدەزانی هەر بوونیشی نییە لە نێوماڵدا، هەر کات ئەو دەگریا، من دەڕۆیشتمە ژوورێکی دیکە دەنووستم، هاوسەرەکەم زۆر گرنگی بە سالم دەدا، زۆریش خۆشیدەویست، بەڵام من ڕقم لێی نەبوو، لە هەمان کاتدا نەشمدەتوانی خۆشم بووێت!

سالم گەورە بوو، بە گاگۆڵکێ دەڕۆیشت، ڕۆیشتنەکەشی زۆر نامۆ بوو، تەمەنی لە

ساڵ نزیکبووەوە، هەوڵی دەدا بە پێ بڕوات، بۆ مان دەرکەوت کە ناتوانێت بە جوانی قاچێکی دابنێ، زانیمان کە شەلە، ئەوەندەی تر لەسەر دەروونم قورس بوو، بەمشێوەیە ڕۆژەکان تێپەڕین، لە دوای سالم دوو منداڵی دیکەمان بوو بە ناوەکانی عومەرو خالید!

ساڵەکان تێپەڕین، سالم گەورەبوو، براکانیشی گەورەبوون، من هەرگیز حەزم نەدەکرد لە ماڵ دابنیشم، هەمیشە لەگەڵ هاوڕێکانم بووم، ئەوانیش وەکو یاری دەستی خۆیان بەکاریان دەهێنام..

بەڵام هاوسەرە میهرەبانەکەم هیچ کات لە چاکبوونم نائومێد نەدەبوو، بەردەوام نزای بۆ دەکردم، سەرەڕای ئەو هەموو نالەبارییەم لە هەڵسوکەوتەکانم توڕەو بێزار نەدەبوو، بەڵام زۆر خەمبار دەبوو کاتێك دەیبینی گرنگی بە عومەرو خالید دەدەمو سالم فەرامۆش دەکەم.

سالم گەورەبوو، هاوسەرەکەم ناوی لە قوتابخانەی تایبەت بە نابینایان، تۆمار کرد..

من هەستم بە تێپەڕبوونی ساڵەکان نەدەکرد، ڕۆژەکان بۆ من چون یەکبوون، چونکە پیشەی من (کارکردن، خواردن، خەوتن، بێداری..).

ڕۆژێکی هەینی کاتژمێر (١١)ی نیوەڕۆ لە خەوهەستام، ئەو کاتە بۆ من زووبوو، بەڵام لەبەرئەوەی بۆ خوانی نیوەڕۆ بانگهێشتکرابووم، هەستام خۆمگۆڕیو بۆنم لە خۆمداو ویستم بڕۆمە دەرەوە، لە هۆڵەکە چاوم بە سالم کەوت کە زۆر بە کوڵ دەگریا، هەڵوێستەیەکم کرد، دوای (١٠) ساڵ یەکەمجار بوو ئاوڕ لە گریانی سالم بدەمەوە، لێی نزیکبوومەوەو وتم سالم بۆچی دەگریت؟

کاتێك گوێی لە دەنگی من بوو، یەکسەر ژیر بووەوە، کە هەستی کرد من لە نزیکییەوەم، هەستم کرد دەیەوێت لێم دووربکەوێتەوە، وەکو ئەوەی پێم بڵێت: ئەگەر تۆ باوکی منیت (١٠) ساڵە لە کوێ بوویت؟ بۆچی بۆ تەنها جارێکیش لە ئامێزت نەگرتم؟ بەرەو ژوورەکەی ڕۆیشت، سەرەتا نەیدەویست هۆکاری گریانەکەییم پێ بڵێ، بەڵام من هەوڵمدا ئارامی بکەمەوەو بۆ یەکەمجار وەکو باوکێك قسەم لەگەڵدا کرد، لە دواییدا هۆکاری گریانەکەی بۆ ڕوون کردمەوەو وتی: عومەری برام درەنگ کەوتووە، ئەمڕۆ هەینییە دەبوا زوو بچم بۆ مزگەوت، چونکە لە ڕیزی یەکەم جێگە نامێنێت، منیش بانگی دایکم کرد، بانگی عومەرم کرد، هیچیان وەڵامیان نەدایەوە، بۆیە دەستم بە گریان کرد.

بە بیستنی ئەم وتانە لە زاری منداڵێکی نابیناو شەلەوە سەراپا جەستەی لەرزاندم، سەیرێکم کردو دەستم بەسەریدا هێناو وتم: تۆ بۆ ئەوە دەگریت کە ڕیزی یەکەمی نوێژی هەینیت لە دەستدەچێت؟؟!!

وتی: بەڵێ.

بەم دیمەنە هاوڕێکانم لە بیرچووەوە، خوانی نیوەڕۆم لە بیرچووەوە، وتم: سالم گیان، نیگەران مەبە، ئایا دەزانیت ئەمڕۆ لەگەڵ کێ دەڕۆیت بۆ مزگەوت؟ وتی: بێگومان عومەری برام! بەڵام هەمیشە ئاوا دوادەکەوێت!

وتم: نەخێر ئەمڕۆ من لەگەڵ تۆ دێم.

سالم بە بیستنی ئەم وشانە سەرسام بوو، وایزانی گاڵتەی پێدەکەم، بۆیە دەستیکردەوە بە گریان، منیش فرمێسکەکانم بۆ سڕیو دەستیم گرتو پێکەوە بە ڕێکەوتین، دەرگای ئۆتۆمبێلەکەم بۆ کردەوە، بەڵام سالم ڕازی نەبوو، وتی: مزگەوتەکە نزیکەو بە پێ دەڕۆین..

بیرم نەدەهات کۆتاجار کەیبووە چوم بۆ مزگەوت، بەڵام دوای ئەو هەموو ساڵانە ئەمە یەکەمجارم بوو، بچم بۆ مزگەوت، مزگەوت پڕبوو لە نوێژخوێن، بەڵام تێبینیم کرد لە ڕیزی یەکەمی مزگەوتەکە جێگەیەك دانراوە بۆ سالم، دوای تەواوبوونی نوێژی هەینی، سالم داوای لێکردم قورئانێکی بۆ بهێنم، سەرسام بووم، لە دڵی خۆمدا وتم: سالم نابینایە چۆن دەتوانێت قورئان بخوێنێت؟ قورئانەکەم بۆ هێنا، داوای لێکردم قورئانەکە بخەمە سەر سورەتی (الكهف)، قورئانەکەی لێوەرگرتمو خستییە بەردەمی خۆی، دەستیکرد بە خوێندنەوەی سورەتەکە، چاوەکانیشی نووقاون، زۆر لام سەیر بوو، هەموو سورەتەکەی لەبەربوو، ئیدی من هەستم بە شەرمەزارییەکی زۆر کرد، دەستەکانم بۆ ئاسمان بەرز کردەوەو داوام کرد خوای گەورە ڕێنمونیم بکات، سەرەتا وەکو منداڵ دەستم بە گریان کرد، زۆر ویستم گریانەکەم بشارمەوە، بەڵام نەمتوانی، هەستم کرد سالم بە دەستە بچکۆلانەکانی فرمێسکەکانم بۆ دەسڕێت، لە ئامێزم گرتو سەیرم کردو وتم: تۆ نابینا نیت، بەڵکو ئەوە منم نابینام!

پێکەوە گەڕاینەوە بۆ ماڵ، هاوسەرەکەم زۆر نیگەرانی سالم بوو، بەڵام کاتێك زانی من لەگەڵ سالم لە نوێژی هەینی بووم، نیگەرانییەکەی بووە هەڵوەرانی فرمێسکی خۆشی.

ئیدی لەو ڕۆژەوە هەموو نوێژەکانم لە مزگەوتدا کردووە، بە یەکجاری لە هاوڕێ خراپەکانم ماڵاواییم کردو بوومە هاوڕێی کەسانی باشو ئاکار جوان، لەو ڕۆژە بەدواوە گرنگییەکی زۆرم بە خێزانو منداڵەکانم دەدا، بەمەش ئومێدو نزاکانی هاوسەرەکەم هاتە دیو ماڵمان پڕ لە خۆشیو بەختەوەریو تەبایی بوو، ئیدی زەردەخەنە بۆ ساتێکیش لە ڕووخساری سالم جیانەدەبووەوە، هەمیشە دڵخۆشو ڕووخۆش بوو..

پاش ماوەیەك سەفەرێکم بۆ هاتە پێش، سەرەتا دوودڵ بووم لە ڕۆیشتنم، بۆ ئەو مەبەستە ڕاوێژم بە هاوسەرەکەم کرد، لەبەرئەوەی ماوەی گەشتەکەم زۆر بوو، واگومانم برد کە داواکەم ڕەت بکاتەوە، بەڵام زۆر بە خۆشحاڵییەوە قبوڵی کرد، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە پێشتر بۆ هیچ سەفەرێکم پرسم پێ نەکردبوو، ئیدی ڕووم کردە سالمو هەواڵی گەشتەکەم پێدا، ئەویش بە خۆشحاڵییەوە ماڵاوایی لێکردم..

ماوەی سێ مانگو نیوم پێچوو، لەو ماوەیەدا هەر کات دەرفەتێکم بۆ بڕەخسایە، پەیوەندیم بە هاوسەرەکەمەوە دەکردو هەواڵی منداڵەکانم دەپرسی، زیاتر لە هەموویان تامەزرۆی دیداری سالم بووم، ئاواتەخوازبووم گوێم لە دەنگی بێت، هەر کات پەیوەندیم دەکرد، یا لە قوتابخانە بوو، یان لە مزگەوت..

هەموو جارێك هاوسەرەکەم بە پێکەنینو خۆشحاڵییەوە هەواڵی تەندروستیو بارودۆخی منداڵەکانی پێدەوتم، بەڵام کۆتاجار کە پەیوەندیم کرد، گوێم لە پێکەنین نەبوو، دەنگیشی گۆڕابوو، وتم سڵاوی من بە سالم بگەیەنە، وتی: بە ویستی خودا! بێدەنگ بوو...

دوای تەواوبوونی ماوەی گەشتەکەم گەڕامەوە ماڵو لە دەرگام دا، ئاواتەخوازبووم سالم دەرگاکەم لێ بکاتەوە، بەڵام لە ناکاو خالد دەرگاکەی لێکردمەوە، باوەشی پێداکردمو هاواری کرد بابە، بابە، نازانم بۆچی کاتێك چوومە ژوورەوە هەستم کرد سینەم توند دەبێت.. وەکو ئەوەی شتێك ڕووی دابێت، هاوسەرەکەم هاتە دەرەوەو پێشوازی لێکردم، بەڵام ڕووخساری گۆڕابوو، وەکو ئەوەی بە زۆر خۆی خۆشحاڵ نیشان بدات، پرسیم چی بووە؟

وتی: هیچ..

وتم ئەی کوا سالم بۆ دیار نییە؟ سەری داخستو وەڵامی نەدایەوە، فرمێسك وەکو بارانی بەهار بە گۆنایدا ڕێچکەیان بەست، هاوارم کرد کوا سالم؟ سالمی من لە کوێیە؟

خالد کە تەمەنی چوار ساڵان بوو بە دەنگێکی بەریئانە وتی: ڕۆی بۆ بەهەشت!

هاوسەرەکەم تەحەممولی نەکرد، زۆر گریا، ئیدی ژوورەکەی بەجێهێشت، پاشان زانیم کە سالم دووهەفتە پێش گەڕانەوەم، دووچاری نەخۆشییەکی کتوپڕ بووەو بەو هۆیەوە گیانی لە دەستداوەو بۆ دواجار ماڵاوایی کردووە!

# هاوڕێی زانکۆ



هۆزان جەلیل حەمە سەلیم

بە ڕوانینی من بۆ ژیان ناتوانرێت ژیان مانای خۆی ببەخشێت، ئەگەر مرۆڤەکان برەو بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان نەدەن، مرۆڤەکان کەم تا زۆر ئەو هەستەیان تیا بەدی دەکرێت بەشێك لە کاتەکانی ژیانیان تەرخان بکەن بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ کەسانێك لە دەرەوەی چوارچێوەی خێزانەکەیان، هاوڕێیەتی بە یەکێك لەو پەیوەندییە کۆمەڵاییەتییانە ئەژماردەکرێت کە کاریگەری لەسەر خودو کەسێتی مرۆڤەکان هەیە، هاوڕێیەتییەك لە یەکێك لە قۆناغە هەستیارەکانی ژیان، لە کاتی ژیانی زانکۆ، گرنگە بزانین کێ دەکەینە هاوڕێی خۆمان، ئەگەری ئەوە دەکرێت بوترێت ئەم وشانە ڕۆژانە دێتە بەر دیدەمان، بۆ ڕەوینەوەی ئەو ئەگەرە دەڵێم لە ساتەوەختێکدا دەژین ڕاستە پێشکەوتنەکان زۆرن، بەڵام هەموو مرۆڤەکان بەختەوەرنین، ڕاستە هاوڕێکان زۆرن، بەڵام هاوڕێ ڕاستەقینەکان دەگمەنن، ڕاستە زەردەخەنەکان زۆرن، بەڵام زۆر کات لە ناخەوە نین، ڕاستە ڕووخسارەکان سپی دەنوێنن، بەڵام مەرج نییە ناخەکان سپی بن، ڕاستە بابەتەکان زۆرن، بەڵام بیرخستنەوەی پێویستو گرنگە.

هیوادارم زۆر لێزانانە هاوڕێی زانکۆمان هەڵبژێرین، ڕاستە کەم تازۆر ئەزموونمان هەیە لەسەر هاوڕێیەتی، چونکە لەو ساتەوەی هەست بە بوونی خۆمان دەکەین لە ڕێگەی تەمەنماندا چەندەها هاوڕێمان ناسیووە، ئەگەر تەمەن بوار بدات بژین هاوڕێیانی تریش لە ڕێگەی ژیانماندا دەناسین. هەموومان کۆکین هاوڕێیانێك زۆرخۆشەویستن، وێنەیەکیان لە مێژووی ژیانماندا نەخشاندووە، لە یادکردنی تا مردن ئەستەمە، ئەوەندە ناوازەبوون، دیاری دەستی ئەوان بۆ ئێمە ڕاستگۆیی‌و بەخشندەیی‌و هاوکاری‌و لێبوردن‌و هێمنی‌و پاکی‌و بەخشینی سۆزو خۆشەویستی بوون، ئەو دیاریانە لە خەزانی دڵماندا ئەپارێزین، تا ببێتە ئاوێنەیەك لە کەسێتی ئێمەدا ڕەنگ بداتەوە، ئەوان بۆنفرۆش بوون هەر بە ژیان لەگەڵیاندا بۆنی خۆشیان بە هەستو ناخی ئێمەش دەبەخشی، پێکەوە ژیانمان بۆنخۆش دەکردو پێکەوە بۆ ژیان زەردەخەنەمان دەکرد!

هاوڕێیانێکی دیکەمان ناسیووە، ئەوانیش ناوازەبوون، بەڵام لە کاری ناپەسەندو نەشیاو، دیاری دەستی ئەوان بۆ ئێمە درۆو خراپەو تاوان‌و ئازارو خەم بوون، ئەوانیش لە خەزانی دڵماندا دەپارێزین، بەڵام دەیانکەینە وانەیەك بۆ ژیانمان تا هاوکارمان بێت بۆ هەڵبژاردنی هاوڕێکانی داهاتوومان، ئەوان وەك ئاگردانێك وابوون بۆ ئێمە، هەتاوەکو زیاتر لێیان نزیك بووینایەتەوە پریشکی ئاگرو زیانیان پێدەبەخشین.

ئازیزانم لەگەڵ هەنگاونان بۆ ژیانی زانکۆ هەوڵ بدە هاوڕێیەك هەڵبژێریت کە هەلگری وشەی هاوڕێ بێت، بەو مانایەی خەندە ببەخشێت لەگەڵ خەندەکانی تۆدا، فرمێسکەکانت بسڕێت لە کاتی خەمەکانی تۆدا، تا لە کۆتادا ئەگەر لێیان پرسیت هاوڕێ باشترە، یان برا؟ لە وەڵامدا بڵێ: هاوڕێ برایەکە خۆت ئارەزوومەندانە هەڵیدەبژێریت، بەڵام برا خاوەنی هەرکەسایەتییەك بێت برایە!

گرنگ نییە هاوڕێمان هەبێت لە زانکۆ، لەوە گرنگتر ئەوەیە بزانین چ جۆرە هاوڕێییەك بۆ ژیانی زانکۆمان هەڵدەبژێرین، پێویستە دیاریکردنی هاوڕێکانمان لەسەر بنەمای جۆرو چۆنیەتی بێت، نەك چەندێتی، چونکە هەمیشە هاوڕێیەکی دڵسۆزو وەفادارو خاوەن ئەزموون، زۆر باشترە لە هاوڕێیانێك کە هەستی دڵسۆزی‌و وەفاداری‌و پێکەوە ژیان‌و ئەمەگداری لەناخیاندا کۆچی کردووە.

با لە کاتی هەڵبژاردنی هاوڕێدا هەوڵ نەدەین شێوەی مرۆڤەکان‌و شێوازی قژو ئەو پۆشاکانەی دەپۆشرێتو مۆدێلی ئۆتۆمبێل‌و مۆبایل پێوانە بێت بۆ کەسێتی هەڵبژاردنی هاوڕێ، بەڵکو با هەڵسەنگاندن‌و پێوانەکانمان بۆ ناخی مرۆڤەکان بێت، بزانین کام سیفەتو کام کردار خۆی تیا نەخشاندووە، جوانی هاوڕێ لە ئاکارو ڕەوشتە بەرزو باڵاکانیانە نەك لە ڕووخساردا.

با هەوڵەکانمان بۆ هاوڕێییەتی ڕاستەقینە بێت، چونکە دونیایەکە پڕ لە ناسکی‌و جوانی‌و گەورەیی‌و بەختەوەری‌و ئارامی‌و ئاسوودەیی، باوەڕبکەن هەژمارکردنی هەموو ئەو ڕۆژانە ئەستەمە کە چەندەها گوفتارو کاری جوان‌و هاوکاری‌و خۆشی‌و شادمانیتان تیا تۆمارکردووە.

با هەوڵبدەین لەگەڵ هاوڕێیانێك بژین کە خاوەنی بەرنامەو پرۆگرامێکی دروستن بۆ ژیانی داهاتوویان، هەمیشە هەنگاوەکانی ژیانیان بۆ داهاتوویەکی پڕ ئامانج‌و گەشبینی‌و ئاواتەکانیانە.

لە کۆتاییدا با دڵنیاش بین دۆزینەوەی هاوڕێیەك لە زانکۆ، کە لە هەموو کردارو بیروبۆچوون‌و ڕەوشتو وردەکارییەکانی ژیاندا هاوتای تۆ بێت، مەحاڵە، قەد هەوڵ مەدە ئەو تۆ بێتو تۆش ئەو بیت، بەڵکو هەوڵبدە بژین لەسەر ئەو بیروبۆچوون‌و ڕەوشتە دروستانەی وەك یەکن، هەوڵ مەدە هاوڕێکەت وەك خۆت دروست بکەیتەوە، کاربکەن بۆ ژیانێك هەردوو لا بەختەوەربژین، ئازیزەکانم ئارامگر بە لە بڕیاردانت بۆ هەڵبژاردنی هاوڕێی ژیانت، بە بۆچوونی من دەوڵەمەندەکان ئەو کەسانەن کە هاوڕێی دڵسۆزیان هەیەو بە یەکەوە زەردەخەنە بە ژیان دەبەخشن، هاوڕێ پێویستە هاوخەمت بێت لە نیگەرانی‌و ئازارەکانتدا.

# هونەری ئەتەکێت لە ژیانی هاوسەریدا

ئا: بێگەرد فارس

ژیان بەبێ دەستوورو یاساو ڕێکخستن، ژیانێکی فەوزەویو دواکەوتووانەیە، ئەوماڵەی لەسەر غەریزەکان بنیاتنرابێت، ئەوا هەر غەریزەکان لە ناوی دەبەن، ئەو ماڵەی لەسەر ئاو دروستکرابێت، هەر ئاو نغرۆی دەکات!

بەڵام خێزانێك کە لەسەر گوێڕایەڵی خوای گەورەو ڕێزوخۆشەویستی بنیاتنرابێت، هیچ بایەك ناتوانێت شیرازەی تێکبدات، هەرچەندە زۆر بەهێزیش بێت.

چەندە جوانە لەناو «خێزان، خوێندنگە، کارگەکان، مزگەوتەکان، شەقام» یاسا بوونی هەبێتو دووربێت لە فەوزاو بێ سەروبەرەیی، بە تایبەتی لە ناو خێزاندا، یەکێك لەو کارە زۆر گرنگانەی کە خوای گەورە تایبەتی کردبوو بە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت: فێرکردنی جوانترینی ڕەوشتەکان بووە بۆ گەلەکەیان.

پەیوەستبوون بە ئاکارە جوانەکانو گرنگیدان بە هەستەکانی بەرامبەرو ڕێزگرتنی بارودۆخو بۆچوونی بەرامبەر بە هونەری مامەڵەکردن، یان ئەتەکێت لەگەڵ بەرامبەردا ناودەبرێت، هەر ئەوەش دەبێتەهۆی بەدەستهێنانی ڕێزو خۆشەویستیو متمانەی بەرامبەر.

زۆربەی جار ئێمە گوێ نادەینە ئەو ڕێگەیەی مامەڵەی پێدەکەین لەگەڵ کەسێکی ئازیز کە لە نێوانماندا دەژی بۆ نموونە: «هاوبەشی ژیان» لەوانەیە بێ مەبەست هەستی بریندار بکەین «یان هەندێجار بە مەبەست»، لەبەرئەوەی وا هەست دەکەین هونەرو نەریتی ئەتەکێت تەنها بۆ کەسانی بێگانەو نەناسراوو دوورە پەرێزیو وشکی مامەڵەش لەگەڵ دۆستو خزمو ناسراوەکاندا!

لێرەدا ڕووی دەممان دەکەینە ئەوانەی تازە چوونەتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە، تا کۆکبنو ڕێکبکەون، لەسەر چەند یاساو سیستەمێك بە شێوەی نوسراوو ڕێکەوتنی هەردوولا، ئەو نوسراوەش هەموو ئەوەی لە ژیاندا بەرپێدەکرێت، یان جێبەجێ دەکرێت تێیدا بێت لەوانە کارو چالاکیو ئارەزوو خوێندنەوەو سەردانو گەشتەکان، ...هتد.

ئەوەش بۆ ڕێزگرتنی هەر لایەك و زیاتر هەستکردن بەنرخی خۆی، یان کەمکردنەوەی سەرپێچیو خراپ مامەڵەکردن.

باش وایە سەرپێچی، یان لە بیرکردنو کەمتەرخەمیکردن لە یاساکانی نوسراوەکە سزایەکی گونجاو، یان سوکی تێدا بێت، بۆئەوەی هیچ کام لەوان نەتوانن لە یاساکە دەربچن، بۆ نموونە ئەوەی سەرپێچی دەکات دەبێت داوای لێبوردن بکات، یاخود دیارییەك بکرێت... هتد.

پاشان بە ڕەزامەندی هەردوولا بە تێپەڕبوونی کات دەتوانرێت بەند بۆ نووسراوەکەیان زیاد، یان کەم بکەن، بەڵام بەردەوام پێویستە یاساکان جێبەجێ بکرێنو ڕێزگرتنو خۆشەویستی لە ئارادا بێت.

ئەو یاسایانە، یان بەندانەی لە نووسراوەکەدا ئاماژەی پێدەکرێت زۆربەی ئەوانەن کە ئاینی ئیسلامو خاوەن بیرو ڕۆشنبیرانیش جەختیان لەسەرکردووەو بە هونەری ئەتەکێت ئەژمار دەکرێت:

* پێش چوونە ژوورەوە بۆ لای هەر یەکێکیان ڕووخسەت وەربگرێتو لە دەرگا بدات.

* کاتی چوونەوە بۆ ماڵ، ژوور، یان ناو ئۆتۆمبێل سڵاو بکرێت.

* کاتی چوونەدەرەوە بپرسن لە لایەنی بەرامبەر، ئایا پێویستی بە هیچ شتێك هەیە، یان نا.

* کاتێك پێنووس، یان کتێب، هتد وەرگیرا بگەڕێنرێتەوە جێگەی خۆی.

* ئەگەر شتێك شکێنرا، یان تێکدرا لە جێی ئەوە بکرِدرێتەوە.

* ئەگەر لایەك هەڵەی بەرامبەر ئەوی تر کرد، بێ دواخستن داوای لێبوردن بکات.

* ئەگەر لایەکیان داوای لێبووردنی لەوی تر کرد، ئەوا پێویستە لێبوردنەکەی قبوڵ بکرێتو واز لە لۆمەو گازندە بهێنێت.

* گفتوگۆی نێوان هەردوولا پێویستە هێمنانە بێتو دەنگ بەرزکردنەوەو وشەی نەشیاوی تێدا نەبێت.

* پێوستە ڕاستی بووترێت هەرچەندە تاڵو ناخۆش بێت، بەڵام بەشێوەیەکی جوانو دوور لە برینداركردن.

* ئەگەر بۆنەیەکی خۆش بۆ هەر لایەك هاتە پێش، بێ هیچ بیانوویەك لایەنی دووەم ئامادە بێت.

* ڕێز لە خولیاو ئارەزووەکانی یەکتر بگیرێت، بە جۆرێك کە خولیای خۆی بێت.

* دوورکەوتنەوە لە دروستکردنی کێشەو بەبیرهێنانەوەی هەڵەکانی ڕابردوو بۆئەوەی خەمو ئازار نوێ نەبێتەوە.

* ئەگەر لایەك تووڕە، یان نیگەران بوو بەرامبەر ئامانجی هێورکردنەوە، یان کەمکردنەوەی بێت، نەك وەڵامدانەوەو زیاتر وروژاندنی بەرامبەر.

* ئەو کارانەی بەهەردوولا دەکرێن، دابەش بکرێنو جێبەجێ بکرێن، پێش ئەوەی داوای لێبکرێت.

* هەرگیز درۆ نەکرێت، هەرچەندە هەڵەیەکی گەورە ڕووی دابێت، چونکە درۆ دایکی هەڵەکانە.

* کاتێك لە نێوان کۆمەڵێکدا بوون هەرگیز یەکتر بە درۆنەخەنەوە، بۆ نموونە لە کاتی گێڕانەوەی باسێکدا قسەی پێ ببڕدرێتو بۆی ڕاست بکاتەوە، یان کەمو زیادی بڵێت، پێویستە ڕێگەی پێبدرێت تەواوی بکات بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێت.

* هەرچەندە پێویستیت بە پارە هەبێت بێ پرس، یان زانیاری ئەوی تر نەبردرێت.

* دەبێت هەر شتێك بۆ خۆی پێی خۆشە، بۆ هاوسەرەکەشی بەهەمان شێوە، بە پێی توانای کار بۆ حەوانەوەو ئاسوودەیی ئەوی تر بکات.

* ئارامگرتن لەسەر ناخۆشییەکان وا سەیر بکرێت پەرستشە، سوپاسگوزاری خوای گەورە پێویستە.

* بانگکردنی یەکتر بەو ناوە، یان نازناوەی کە هاوبەشی ژیان پێی خۆشەو دوورکەوتنەوە لە نازناوێك کە بێزارو نیگەرانی دەکات.

لەوانەیە زۆربەمان وا هەست بکەین دانانی نوسراوی لەو جۆرە مەحاڵ، یان بێ سوود بێت، بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەگەر هەردوولا بڕیاری لەسەر بدەنو ڕێکبکەون، ئەوا بە ئەنجامەکانی زۆر خۆشحاڵ دەبن، بەمەرجێك ئەگەر بە جدی وەری بگرنو دوور بکەونەوە لە گوێ پێنەدانو کەمتەرخەمیکردن، دەتوانرێت هەرکەسەو بە پێی بارودۆخو جۆری ژیانی بەندەکان دەستکاری، یان زیادی بکات، مەرج نییە ئەو بەندانە ستاندەر بنو گۆڕینیان مەحاڵ بێت.

# نامە نوریەکان

## نامەی یەکەم

دەزانم بەرەنگاربوونەوەی شاوەت و ئارەزووەکان کارێکی زەحمەتە بۆ کەسێك کە نەیتوانیبێ جڵەوگیری نەفسی خۆی بکات و لەپێناو خۆشەویستی خودادا هەموو جۆرە قوربانییەك بدات!

ئازیزەکەم، ڕۆچوون لە بەهەشتی خۆشەویستی خودادا وادەکات مرۆڤ لە ململانێ لەگەڵ حەزوئارەزووەکانی دونیادا هەست بەتام و چێژێك بکات، کە هەرگیز لە گوێڕایەڵی نەفسی ئەممارەو گەیشتن بەباق و بریقی سەراب ئاسای حەزوئارەزووەکاندا بەدیناکات!

ئەمن، تا لە خۆشەویستی خودا تێنەگەیشتم نەمدەزانی حەقیقەتی خۆشەویستی هەرچییە! هەرچەندەم خوێندەوەو هەرچەندی گەڕام لەدواییدا زانیم خەڵکی خەریکی چین و چۆن دەڕواننە خۆشەویستی و حەقیقەتی ئەو ناوەبەرزەش لە کوێدا بەدی دەکرێت! ئەو کات زانیم ئەوەی خودای خۆشنەوێت، باوەڕناکەم هەرگیز بتوانێت بەتەواوی مانا، کەسی خۆشبوێت!

هەمیشە ئەو چیرۆکەم لەیادە کە مامۆستاکەم بۆ پێناسەی ((خۆشەویستی سادەو بێ مانا)) بۆی گێڕاینەوە.

مامۆستا دەیگوت، جارێك قوتابییەك لە مامۆستاکەی دەپرسێت، مامۆستا خۆشەویستی چییە!؟

ئەویش دەڵێت، بچۆ لە گوڵزاری قوتابخانەکەدا جوانترین گوڵم بۆ بێنە، ئەویش ڕۆیشت و پاش ماوەیەك بەدەستی بەتاڵ گەڕایەوە!

مامۆستا لێی پرسی بۆچی بەدەستی خاڵی گەڕایتەوە؟

گوتی، مامۆستا سەرەتا گوڵێکی زۆر جوانم بەدیکرد، گوتم بابچم بزانم گوڵێکی جوانترم دەستناکەوێت، تا من بەنێو گوڵزارەکەدا گوزەرمکردو گەڕامەوە بۆلای گوڵی یەکەم، تەماشادەکەم نەمابوو!!

کەواتە زۆربەی مرۆڤەکان بەئومێدی جوانترو قەشەنگتر هەڵبەت لە ڕووکەشدا، بەدووی خۆشەویستی نوێدا دەگەڕێن، کاتێك خۆشەویستی ڕاستەقینەیان دەدۆزنەوەو دەگەڕێنەوە بۆلای دەبینن، کە ئەو ماڵئاوایی لێکردون!!

وەلێ مرۆڤە ژیرەکان وێڵ و

ئازاد محێدین

سەرگەردانی سیماو ڕوگەشنین و دەزانن چییان خۆشدەوێتو کێیان خۆشدەوێت، لە دنیاشدا خوداوەند ڕووخساری بێ وێنەی خۆی لە خۆشەویستان شاردۆتەوە، تا بەچاوی دڵ تەماشای بکەنو بەتاسەو شەوقێکەوە شەیدابن، کە تا ڕۆژی دیدار ئەو تاسەیە نەشکێت!!

بۆیە کاتێك دەچینە نێو کۆڕی یادی خوداو سەرێك دەدەین لە ژووانی خۆشەویستی خواویستان و ڕێبوارانی ڕێگای بەهەشت، ئەوسا سەدای گریان و خورەی فرمێسك و ناڵەی نەی ئاسا لە دالانی موحیببەتدا دەنگدەداتەوە!

گەرتۆ ڕازی بی و دونیام ئەشکەنجە
خوێنم خەنەبێ بۆ دەست و پەنجە
ماڵ و سەروەت و سەروسامانم
پاکی بەفیدای ڕووی تۆ دەزانم
هەرتۆ بە بەندەی خۆتم بزانی
ئاوڕ نادەمۆ بۆ دونیای فانی
شەوانە کاتی دەستلەملانی خەو
دێمە ژووانی بێدارانی شەو
لەنێو میحرابی ڕازی ئیلاهی
لەسەربەرماڵی ژووانی خودایی
بەسەر ڕوومەتی زەردی خەمنشین
ورد دێنەخوارێ فرمێسکی ڕەنگین
چرپەیە، ڕازە، دوعاو نزایە
هاواری بەندەی ڕوو لە خودایە
شەوەن، تاریکەن ماڵ بێ ئەغیارەن
عالەم خەفتگەن دۆست خەوەرداڕەن*
چ بەهەشتێکە ئەم جێ ژووانە
کۆڕی گریانی ئەهلی ئیمانە
گەر بۆ یادی تۆ، دڵ نەیاتەجۆش
دیارە نەماوە ئەقڵ و فام و هۆش
من تۆ بناسم کەسم بۆ چییە؟!
باکم بە نازو نیگای کەس چییە؟!
لەدوای سیمای تۆ بڕوانمە بەشەر؟!
خۆمخەمە داوی ڕێگای پڕ خەتەر؟!
من جگە لە تۆ دڵ نادەمە کەس
بۆ ڕووی تۆ نەبێ ڕوو نادەم وەکەس!
پەروەردگارا، غەرقی عیسیانم
کوشتەی گوناهو هەڵەو تاوانم
بمبەخشە ئەوا هاتوومە دەرگات
مەشکێنە دڵی بەندەی پڕ ئاوات

خۆزگە، دەتزانی خۆشەویستی خوا
وەختێ ئەمامی، لەدڵدا ڕووا
ژیان دەبێتە، چ گوڵستانێ
داماوە ئەوەی کەوا نایزانێ
ئەو ڕۆحەی بە خوا ئاشنا نەبووبێ
هەژارە، ئەگەر دنیای هەبووبێ
بێ خۆشەویستی و نوری خودایی
دنیا تاریکەو دیدەش کوێرایی
خێراکە، چرا هەڵکە درەنگە
دردە بەتاری ئەو شەوەزەنگە
ئاودامان جلی سپیت بپۆشە
ئای کۆڕی زیکر چەند پڕ خرۆشە!
با لە کونجێکی میحرابی ئەوین
بۆ ساتەوەختێ تۆزێ بسرەوین
دوور لە شەیتان و نەفس و ئەم دنیا
با ئاوێتەبین بەیادی خودا
ئیتر ژینی من ناچێ بێهودا*
بوین بەڕێبواری ڕێبازی هودا!!

کاتێك گەیشتمە کۆتایی نامەکەی، خۆر خەریك بوو ئاوادەبوو، ئاسۆ سور هەڵگەڕابوو، وەکو چاوەکانی من ببوونە گۆمی خوێن!

جاران، گریان بۆ من، تەنها خەم بوو، ئێستا ئۆخژنی دڵمەو خۆشترین ساتەکانی ژیانم ئەو ساتەیە کە فرمێسکی پەشیمانی هەڵدەوەرێنم، ئێستا دەزانم کە ژیان بێ خۆشەویستی و فرمێسك و تاسەو چاوەڕوانی و سۆزو میهری خودایی، چ بیابانێکی وشك و بێ ئاوە!؟

ئێستا، کە ئەو کۆچی کردووەو ماڵاوایی لەم دنیایە کردووە، بەڵام سیمای پڕنورو وشە جوانەکانی هەمیشە لەبەر دیدەی خەیاڵی منن، بە ئومێدی دیدار لە بەهەشتی کردگارا درێژە بەژینی کورتی ئەم دنیایەم دەدەم!

خودایە بەڕێبواری ڕێگای بەهەشتمان قبوڵ بکەیت و بەسۆزو میهری خۆت دەستی لاوازمان بگریت و لە نوری خۆت مەحرومان نەکەیت!!

* ئیلهامە لە شیعرێکی مەولەوییەوە.
* بێهودە: واتە بێسوود لەبەر کێشی شیعرەکە بووە بە بێهودا.

ع.ش. شێرکۆ

# من وێمو یارا

ئەی خوا ئێشەو ئاوردم هانا
من وێمو یارا جەوێم ڕیانا
قەبوڵ فەرماوە بینایی چاوان
هەتا منو وێم بەیۆی نەیاوان
شەوەن دەورووبەر چۆڵو بێدەنگەن
سیمام چوون گەڵای پایز بێڕەنگەن
وێم جەڕای جەننەت نابەڵەد کەردە
جەهەننەم لایەق کردەی پەردە
تەمام شەرمەندو خەجاڵەت بارم
ڕووی زەردم ئەو تۆن گۆش دەهاوارم
ئەر فرسەت مەنەن ئەجەلم ئامان
پەی باقی عومرم خواگیان ئامان
سا ئەگەر غایەو فکرو ئەفکارم
بە خەیر مەگێلان گوفتارو کارم
ئەگەر بێ نەفعەن عومرێ مەندەنم
پەی بەرای پەسەند تۆ نەبەردەنم
ئەر عاقیبەتم بی خەیرەن هەران
خەڵکی بە بییەم ئۆخەی مەکەران
هانای بەدبەختیم وەڵای کێ بەرون
داوای هیدایەت من جەتۆ کەرون
سا هیدایەتم پەی سەرفرازی
یا بەوێت قەسەم من مەبوو ڕازی
مەردەنیم خاسەن گوناهێ کەم تەر
نەژیوانم بۆ، با نەلان دەفتەر




# لەگەڵ وەفایی دا

ئەدەبی کوردی ٥

هێند نەخۆشی دەردی دووریم، وەختە گیانو دڵ دەرێ
کوا نەسیمی صوبحدەم بێ عەرزو حاڵی من بەرێ
دەردەدارم، بێ زمانم، بێ دڵم، سەوداسەرم
ئاخ لە بۆ دڵ میهرەبانێ، هەم زمانێ، هەم سەرێ
کەس بە حاڵی سۆزو گریانی من ئاگادار نییە
ئاخ لە بۆ یەك حاڵ زانێ، دڵ پڕ ئاوو ئاورێ
پێم بڵێ وەجهی چییە، زوڵفت موقیمی ڕوومەتە؟
خۆ بەشەرعی موستەفا، جەننەت بە کافر نادرێ!

وەفایی شاعیر ناوی (میرزا عەبدوڕەحیمی) سابڵاخییەو ساڵی (١٨٤٤)ی زایینی لە سابڵاخ هاتۆتە دنیاو ساڵی (١٩١٤) لە شام دوای گەڕانەوەی لەسەفەری حەج کۆچی دوایی کردووە.

لە شیعری (وەفایی)دا، هەستێکی پڕخرۆشی خۆشەویستیو ئەوینی ڕاستەقینەو سەمفۆنیای سۆزو گریانێکی بێ سنورو تاسەیەکی پڕ لە ئاهو ناڵین بەدیدەکرێت، دەڵێی: هەموو دێڕی قەصیدەیەکی وەفایی، بە خوێنی دڵو ئەسرینی چاوی نووسیوە، لە شیعرەکانی (وەفایی)دا، ڕازی ئەوینێکی بێ وێنەو نمونەی عاشقێکی سەودا لەسەر دەبینرێ، کە هەمیشە ڕۆحی لەسەر دەستی داناوەو دەستەونەزەر لە خزمەتی یاریدا ئامادەیە!

بێگومان وەکو خۆی دەڵێت: هەموو کەس لە حاڵی ئەو شارەزا نییەو ئەوەی ئاگاداری حاڵی (وەفایی) نەبێت، نازانێت لە ئاگری چ عیشقێکدا دەسووتێت:

کەس بە حاڵی سۆزو گریانی من ئاگادار نییە
ئاخ لە بۆ یەك حاڵ زانێ، دڵ پڕئاوو ئاورێ

یاخود وەسفی حاڵی خۆی دەکاتو دەڵێت:

لە تاو دەردی دڵی دێوانە خوێن دەگریمو نازانم
نەخەستەی چاوەکەی مەستم، نەڕەنجەی پەنجەکەی ئاڵم؟
گوتی: بۆ کوێ دەبەی ڕۆحت (وەفایی) دەوریان گرتی
نیزامی پەرچەمو سەربازی زوڵفو عەسکەری خاڵم

یاخود چەند شاکارێکی بەرزە کە دەڵێت:

دڵ دەناڵێ، دەم بە دەم سووتاوی تاوی فیرقەتە
بولبولە بۆ ڕووی گوڵ، دڵ پڕ لە داخو حەسرەتە!
چاو پڕ ئاوو دڵ پڕ ئاور، دڵ بە دولبەر چاوەڕێ
ئەی خودا دەردی جودایی چەند گرانو زەحمەتە؟!

یاخود دەڵێت:

سەحەر مەستانە هات، بولبول بە شادی بۆ تەوافی گوڵ
کە دی باغ بێ گوڵە، داغ بوو، بە سەد ئاهو فوغان ڕۆیی
مەڵێن: بولبول مەناڵێنە کەوا گوڵ گوڵشەنی چۆڵ کرد
دڵ ئارامی نەما چ بکا؟ کە ئارامی دڵان ڕۆیی
بە ناڵەی بولبولو قومری (وەفایی) بۆیە هەر دەگریم
گوڵێکی سەرو باڵام بوو، بە تاراجی خەزان ڕۆیی

یان دەڵێت:

دەسا ڕوحمێ وەفادارم، بە حاڵی دادو هاوارم
کە وەك بولبول دڵی زارم دەناڵێ بۆ گوڵی زارت
سەرم ناوێ ئەگەر نەیخەم بە حەڵقەی پەرچەمو چاوت
دڵم ناوێ ئەگەر نەیکەم بە فدییەی چاوی عەییارت

(وەفایی) زێتر لە هەموو شاعیرانی کلاسیك ڕێگای عاشقانی ڕوونکردۆتەوەو یەکێك لە هەرە شیعرە بەناوبانگەکانیشی قەصیدەی (ئەی دڵ وەرە هۆشیار بە (هذا طریق العاشقین)ە:

بۆیە دەڵێت:

فەرموویە (وەفایی) کە دەبێ ئەهلی نەزەربێ
عاشق ئەوەتا هەمدەمی ئەنفاسی سەحەر بێ
سێڵاوی سرووشکی هەموو خوێناوی جگەر بێ
بۆ تەوفی ڕیازی حەرەمی قیبلە لەبەربێ
ئەو سەعییە سەفای عومرە ئەگەر عاشقی یاری؟!

هەروەها دەڵێت:

وەسڵو گریان، قوربو هیجرانە تەریقی عاشقان
فەسڵی گوڵ بۆیە لەسەر چاوان وەها ئاو دێتە خوار!

سیمای شیعری (وەفایی)ش، وردیو ناسکیو مانای زۆر جوانە: تەماشای ئەم وەسفانەی بکە:

چەند بەناز دێیو دەچێ سەرخۆشو شۆخو شەنگو مەست
ئەی گوڵی نازدار، ئیلاهی، بای خەزانت لێنەدا
باغ دەبێ هەر گوڵفرۆش بێ، یار کە دێتە پێکەنین
(با) دەبێ عەنبەر بەبادا، ئەو کە زوڵفان بادەدا

یاخود دەڵێت:

یاری من هەرگیز لە قەتلی عاشقی پەروای نییە
چونکە ڕوومەت شەمعە، بۆیە حەز بە سووتانم دەکا!

یاخود دەڵێت:

دلبەرا، تۆبیو سەرێ زوڵفت بە عاریز داوەرە
کێ دەڵێ ئاخر کە شەو بێ ڕۆژە، ڕۆژ بێ سێبەرە؟!

ئەمە تەنها گوزەرێکی خێرایە لە گوڵزاری شیعری (وەفایی)دا، بۆ زێتر ئاشنابوون بە شیعری بەرزی (وەفایی) زیارەتی دیوانی (وەفایی) بکەنو لە لاپەڕە (٩٩)دا شیعری:

خۆشە ڕۆژێ لە عالەم دەربەدەربم
لە نێو ئەوزاعی دونیا بێ خەبەر بم

بخوێننەوە. هەرشادبن!

شێخانی